

# لەم وڵاتەدا

و

## چەند چیرۆکێکی دیکە

## عەلی ئەشرەف دەروێشیان

لە فارسییەوە

گوشاد حەمە سەعید



کورتە چیرۆک

# لەم وڵاتەدا
# و چەند چیرۆکێکی دیکەش

عەلی ئەشرەف دەروێشیان
لە فارسییەوە : گوشاد حەمە سەعید



# خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە


- **لەو وڵاتەدا و چەند چیرۆکێکی دیکەش**
- **نووسینی:** عەلی ئەشرەف دەروێشیان
- **وەرگێڕانی لە فارسییەوە:** گوشاد حەمە سەعید
- **نەخشەسازی ناوەوە:** گۆران جەمال رواندزی
- **بەرگ: رێمان**
- **نرخ:** ٣٠٠٠ دینار
- **چاپی یەکەم** ٢٠١٤
- **تیراژ:** ٧٥٠ دانە
- **چاپخانەی** موکریانی (هەولێر)
- بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەی گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (٦٠٨) ساڵی ٢٠١٢ی پێی دراوە.

**زنجیرەی کتێب (٨٢٠)**





ماڵپەڕ: www.mukiryani.com

ئیمەیل: info@mukiryani.com

# ناوەڕۆک

# پێشەکی چاپی دووەم

وا دیارە لە چاپی دووەمی ئەم کۆمەڵە چیرۆکەی عەلی ئەشرەفی دەروێشیان جگە لەوەی کەمێ دەستکاری رێنووسی چاپە کۆنەکەم کردووەو. کەم تا کورتێك ئەگەر هەڵەیەکی چاپی تێدابووبێ چاککراوەتەوەو بەو هیوایەی هەڵەی نوێ شوێنی نەگرێتەوە.

ئەمە لەلایەك لەلایەکی دیکەوە لەسەر هەندێ لە چیرۆکەکانی چەند رستەیەکم نووسیوەو ئەگەر زۆر بەقوڵیش نەبێ بیروڕای خۆم لەمەڕ چیرۆکەکان دەربڕیوە، بەڵام بەداخەوە ئەو نووسینانە هەموو چیرۆکەکان ناگرێتەوە. ئەمە جگە لەو نووسینەی سەر چیرۆکی (لەگەڵ کۆخەکۆخی بابمدا) کە هەر لەو سەرچاوەی کە چیرۆکەکەم لێوەرگرتووە، ئەو نووسینەشم وەرگێڕاوە.

لەبیرم نەچێ کە (٦) چیرۆکەکەی دوایی لە چاپی یەکەمەکەدا نییە و بەڵام وام بەباش زانی لەگەڵ کۆمەڵە چیرۆکەکەی (لەم وڵاتەدا) بەیەکەوە چاپیان بکەمەوە.

ئەم کۆمەڵە چیرۆکەی دوایی هەمان شێوازی عەلی ئەشرەفە و درێژبوونەوەی هەتا درێژەکەیەتی، ئەمە لەگەڵ ئەوەشدا هەست بەگەشدارتربوونی شێواز و ناوەڕۆکی چیرۆکەکانی دەکەی و بایەخی زۆرتر بە هەردوو لایەنیان دەدا.

بەو هیوایەکی توانیبێتم دەستی ئێوە بگرم و نەختێ جیهانی نێو چیرۆکەکانی عەلی ئەشرەفتان نیشاندەم)، یانی بەهۆی ئەوو چیرۆکەکانی بەخەمەکانی خۆتان زێتر ئاشناکەم هیوادارم ئەم چەند لاپەڕەشمان لێ قبول بکەن.

گوشاد حەمە سەعید.
٢٠١٤/١/١٧
هەولێر

## پێناسەیەك

ئەوەنــدەی لــەبارەی عــەلی ئەشــرەفەوە قســە بکــەین هەڵــدەگرێ. شــایەدیش چیرۆکەکانیەتی بە ڕاستی عــەلی ئەشــرەف چــیرۆك نووســێکی بــە توانــا و وردبــین و هونەرمەندە لە داڕێژتنی ڕووداوەکانی دەوروبەری بەم شێوە هونــەری و ناوەرۆکــە لــە روو سادە و روون، بەلاّم قووڵ و پڕ مەعنایانــەی کــە خەمــە رۆژانەییــەکانی مرۆڤــی چەوساوە دەردەبڕێ و پەیوەندییە کۆمەلاّیەتییە ناڕەواکانی ریسوا دەکا.

عەلی لەبەر ئەوەی لە خێزانێکی هەژار و چەوساوە لە گەڕەك و کۆلاّنە هــەرەپیس و دواکەوتووەکانی کرماشان پەروەردە بووە کە تێکڕای سیاناو و ئاوەڕۆ پیسەکانی ئەم شارەی پێدا تێپەڕ بووەو بە تایبــەتی ئــاوەڕۆی (ئاشــورا) کــە نووســەر وێــردی ســەر زمانیەتی دەیکاتە رەمزی نا عەدالّەتی کۆمەلاّیەتی و جوانترین و خۆشترین گۆڕەپانی یادگار و پەروەردە بوونی رۆژانەی.

- عەلی ئەشرەف باس لە دواکەوتووترین بیرو باوەڕە کۆمەلاّیەتییــەکان دەکــا کە خەڵکانێك لە

نیوەی دووەمی سەدەی بیسەمدا لە چارە سەر کردنی گیروگرفت و ناخۆشییەکانی ژیانیا بەکاری دەهێنن...

ئەدی ئەمە نەکــەن چــی بکــەن ؟! کــە چەوســانەوە بگانــە ئــەم ڕادە هۆشــیاری کۆلاّیەتیش هەر ئەوەندە دەبێ و ژیانی کۆمەڵیش بەم جۆرە دەڕواتە ڕێ.

- کەسانی ناو چیرۆکەکان هەر لە خۆی ئینجا ئەندامانی ناو خێزانەکەی ئینجا دانیشتوانی حەوشەکەیان و دەرو دراوسێی گەڕەکەیانەوە پێك دێن، چونکە ئەمانە روونترین نموونەی چەوسانەوەو دواکەوتەیین، عەلی ئەشرەف لە لادێکانی ئێران و کوردستانی لە قەبەڵ ئێراندا مامۆستا بووە لەبەر ئەوە بە وردی باسی ژیانی لادێیی و دوا شێوەی برسییەتی و پاشماوەی دابونەریتە دەرەبەگییەکان دەکا کە چۆن چین و توێژە دەسەلاّتدارەکان لە داپلۆسینی گیانی خەڵکەکەن.
- منداڵ شوێنێکی تایبەنی هەیە لە ناو چیرۆکەکاندا لەبەر ئەوەی منداڵێش پێوەندە بە خێزان و باوکەوە حاڵیان لە حاڵی خێزانەکانیان باشتر نییە.
- هەر چەندە عەلی ئەشرەف بە زمانی کوردی نانووسیٚ، بەلاّم لایەنە نەتەوایەتیەکانی خۆی لە بیر نەچووە زۆر لەسەر چەوسانەوەی ئەویش دەڕواو زۆر جار فۆلکلوری کوردی ناوچەی کرماشان و وشە و پەندی کوردی و کەسانێکی کورد کە رەمزی قارەمانیێتین دەکاتە هێوێنیٚ چیرۆکەکانی..

ـ گوشاد ـ

کۆیە ــ ٢٨ــ ١ ــ ١٩٨٥

## چی روویداوه دایه گیان ؟

وەکو هەموو رۆژێك دەرگای کردەوە. ناڵەی وشك و تەزیوی (ئاشورا) خۆی بەناو ژوورەکەدا کرد. هات وهاواری دوو کەس دەهاتە گویٚ شەرو دەعوایان بوو.

دایکم ئێمەی لەسەر چوار پا داناو. لێفەی لە هەر چوار دەوری چوار پاوە بەسەر قاچ و شانماندا دا. من و ئەکبەر و ئەسغەر ئــەم کارەمــان زۆر لیٚ خــۆش دەهــات. تامێکی تایبەتی هەبوو. سەرما لە دەرگای ژوورەکەوە دەهاتە ژووریٚ.

سۆزی سەرما و قرە قرِی قەلەرِەشان (ئاشورا)[1] ی پرِ کردبوو. پیاوێك ســەربانی ژوورەکەی بە پشتە بێلٚ دەپەستیەوە. کێشکە[2] دەنووکیان لە قورِوکای سەربان دەدا.

دەنگی گەنمەشامی فرۆشی رۆخ (ئاشورا) خەمی ئێمەی زیــاتر دەکــرد، چــونکە پارەمان خستبووە ناو دەخیلەکەمانەوە ، دایکم ماڵی دەماشــت[3]. بەســەر و رووی پەشۆکاو و قژی ئاڵۆزکاو و لێو بەباری، وەك هەموو رۆژێك ئاگری لە ناو مەقەڵەدا کردەوە. خستیە ژێــر چــوار پــاوە. لێفــەی لەســەر چــوار پاکــەوە داگرتــە خــواریٚ سەرمامان بوو هاتینە خوارەوە و تا ملمان خزاینە ژێر کورسیەکە دایکم بۆ نیوەرِۆ سیٚ سەلکە داندۆکی لە جامێکدا خوساند. ئەو کلاٚشانەی کە چنی بوونی و تەواوی کرد بوو هەڵی گرتن و رۆیشت چوو بیداتە خاوەن کارەکەی و بیســت و پێــنج رِیــال هەقدەسی وەرگریٚ و بۆ شەو خواردنێکی پێبکرِیٚ.

---

١- ناوی: ئاوەرِۆی سیاناوی شارەکەیانە

٢- کێشکە: چۆلەکە

٣- ماشتن: گەسکدان، ماڵین

ژوورەوە تاریك و بێدەنگ بوو. پرخە پرخی باوکم نەدەهات. تڕو تەشـقەڵەکانی نەبوون. شەڕەکانی کە لە سەر خـەرجی رۆژانـە دەیکـرد و ئاهـانگی هەمیشـەیی دەنگی و نزاو پاڕانەوەی پاش نوێژ کردنی نەدەهات. زیل و بەمەکانی دەنگی کاتی خوێندنی دووعا و کتێبی دوعا:

- یا حاجەتول حاجات..

دەنگی پڕ لە پاڕانەوەی نزاکانی لەگەڵ مەزلۆمی تایبەتی خۆی ، کاتێـك کـە دایکم بۆ وەرگرتنی خەرجی زۆری لێدەکرد و باوکیشم بە ناڵەیەکەوە دەیوت:

ـــ عەسر ، عەسر!

یەعنی عەسر خەرجی دەدەم. کە عەسریش دادەهات دەیوت

ـــ بەیانی ، بەیانی.

بەیانیش دەیوت:

ـــ عەسر ، عەسر.

ئەمە ماوەی کێشا زۆر عەسرو بەیانی داهات و باوکم هەمیشە دەیـوت پـارەم نییە و خەرجی بە نا تەواوی دەدا ، یان هەر نەیدەدا و هەمیشە قەردار بوو. هەندێ رۆژیش کار دەگەیشتە کوتەك کاری. ئیتر باوکم وەك ئەو مرۆڤە ئاسـاییەی جـاران نەدەما.

کەزی دایکمی دەگرت و لە دەوری چوارپادا دەیسوڕاندەوەوە ئێمە پڕ بە دەنـگ دەمان قیژاند.هاوارمان دەکرد. ڕامان دەکردە دەرەوە تاکو دراوسێیەکانمان گوێیـان لە دەنگمان ببێ و بە هاوارمانـەوە بـێن. دووبـارە دەگەڕاینـەوە و دەسـت و پێـی باوکمـان مـاچ دەکـرد. زیـڕە جگـەر بڕەکـانی ئەسـغەر هەمیشـە لـە گوێمـدا دەزرنگێتەوە. ئەو زیڕانەی هەتا هەتایە بـە بێـداریم دەهێڵنـەوە لـە دژی هـەموو ئەوانەی خەرجیان بە مفتە خۆری دێتە بەردەست و لە دژی ئەو کەسەی ورگـی وەك مەشکە پڕە و کارێك ناکا دەیەوێ باخەڵیشی پڕ بێ. لـە دژی ئـەو کەسـانەی کـە گوێیان کەڕە و زیڕەی ئەسغەر نا بیستن ، ناڵە ناڵی دایکم نابیسـتن ، لـەدژی ئـەو

کەسانەی تێنەگەیشتن و نەیانزانی و نەیانوویست بزانن بۆچی هەمیشە بەری چاوی دایکم لە دەردەداری مۆر هەڵگەڕابوو ، هەمیشە قژی شانە نەکراو و پەرش و ئاڵۆز و پڕ دەرد بوو هەمیشە برسی بوو تاکو ئێمە نیوە تێر بکا.

ژوورەوە بێدەنگ و سارد بوو. هەڵمی دەممان دەبینرا.

رۆژی هەینی بوو ، باوکم لە نارِحەتی خۆی چوو بووە دەرەوە. دەچوو لە کن مامە رەحیمی محەلەبی ساز دادەنیشت دەفتەرەکانمان کاغەزی سپی تێدا نەمابوو لەسەر بەرگەکەشیمان هەر نووسیبوو.

دەمان ڕوانیە وێنەی شاژنی ئینگلیز و مێردەکەی کە بە دیواری ژوورەکەماندا هەڵواسرا بوو نەمان دەزانی باوکم لە کوێی پەیدا کردووە. ئەو هەموو میدالیایانە ئەو جلوبەرگە باش و ئەو زەردەخەنە بێ میهرو نیگا ساردوسڕانە. دەنگی گەنمەشامی فرۆش لە کۆلانەوە دەهات. دوو پشیلە شەڕیان بوو. پشیلە دەنگیان چەند لە مرۆڤ دەچێ.

پیاوێك لە کۆلان بانگی کوڕەکەی دەکرد و پێدەکەنی. لە ڕاستیدا باوکیشم هەندێ شەو پێدەکەنی، هەر شەوێك پارەی هەبووایە نەیدە وت: ــــ

ــــ سبەی، سبەی.

ئەو شەوە باوکم پێدەکەنی. سەلکە تورێکی دەکڕی و لەگەڵ خۆیدا دەیهێنایەوە. کە لە دەرگا دەهاتە ژووری بە پێ دزیلکە دەهات و دەسماڵەکەی ناو دەستی دەکردەوە و لە نکاو پێدەکەنی و دەیوت:

ــــ منداڵینە کاڵەکی زستانەم بۆتان هێناوە! کاڵەکی زستانە! ها ها! تەنیا شەوێك تووڕە بوو. شەوێك دەمویست تور قاش بکەم بەلاّم یەکەمجار لەسەریەوە دەستم بە قاش کردنی کرد. باوکم نارِحەت بوو. زەردەخەنە لە روویدا نەما. چەقۆی لە دەستم وەرگرت و بە پانایی چەقۆ بە پشتی دەستمی داکێشا:

ــــ (تورەکەی لە ناوەڕاستەوە قاش کرد نەك لەسەریەوە ، تاکو شیرین بێت و وتی: ئەدی قوتابخانە چیتان فێر دەکا!

توخمت ببڕێتەوە دەست و پێ سپیەتی.

خۆی تورەکەی قاش کرد.

ئەو شەوانەی باوکم بە کەیف بوو توری دەکڕی ، دایکیشم ئەو تۆو ناوکانەی دەبژاند کە هاوین کۆی دەکردەوە. دادەنیشتین دەمانخوارد باوکم چیرۆکی بۆ دەگێڕاینەوە ئامۆژگاری دەکردین ڕووی دایکم وەك گوڵ دەگەشاوە و لێوی تەڕ دەکرد و میهرەبان و گەش دەبوو ئێسکی سوك دەبوو.

* * *

هەڵسام و کەمێکم لە ئاوی ترخێنە هەڵ قوڕاند. تامی ترش بوو تامی کۆنە ماستاوی کەڕو لێدراوی دەدا (ئەسغەر) لە ژێر چوار پایەدا نووستبوو ، ئەکبەر لە دوای منەوە هات و وەك من ئاوی ترخێنەی خواردەوە.

لەبەر ئەوەی لە من درەنگتر بێنی لە جامەکە کردەوە زللەیەکم لە پشتی ملی قایم کرد. بە بێ دەنگی رۆیشت و لەسەر چوار پایەکە لێی کەوت. چکەی ئەو فرمێسکانەم گوێ لێ بوو کەوا دەڕژانە سەر دەفتەرەکەی ، رقم لە خۆم و تێکڕای ئەو کەسانە هەڵسا کە چەن جامێك ئاوی ترخێنە دەخۆنەوە.

دەنگە دەنگی گەنمەشامی فرۆش گوێی کۆلانی کاس کرد بوو. دەنگ و هاواری بە جۆریك خستمیە غایلەوە[1] لە ناکاودا خۆم لە رۆخ دەخیلەکەمدا بینی. بە پانایی چەقۆ خەریکی دەرهێنانی پارە بووم. ئەکبەر و ئەسغەر لە بەرانبەرمدا دانیشتبوون و هەموو هەست و هۆشیان لە کن دەستم بوو. لە قادرمەکان چوومە خوارێ. سەرما پژایە ناو هەموو گیان و ئێسقانەکانمەوە. لە سەرما چۆقەی ددانەکانم دەهات.

گەنمەشامی فرۆشەکە چەند جارێك دەستە سوور هەڵگەڕاوەکانی بەناو کیسە چڵکنەکەیدا کرد. ریالێکم دایە، لەتەك چوار پایەکەدا لەگەڵ ئەکبەر و ئەسخەر کە هێشتا خەوی نەڕەویبۆوە، دانیشتن و گەنمەشامیەکەمان خوارد.

---

١- غایلە: خەیالآت ، بیرکردنەوە

هێشتا تەواومان نەکرد بوو کە دایکم بەسەرا سیمەیی لە بازار گەڕاوە. بەپرتاو ، خەمبار ، رەفتاری شێتانە ڕای کردە بنەبان. ناو دەلاقـەی پشـکنی. چـرایەکەی بەرز کردەوە ، بەم جوولانەوەیە کراسی بەر بلەوری چـرایەکە کـەوت و بـەر بـۆوەو شکا. لەگەڵ دەنگی شکانی شووشەی چراکە بە هەردوو چـەپۆکی بەسـەری خۆیـدا کێشا.

هەرسێکمان بە ترسەوە ، سەرمان لە ژێر لێفەدا دەرهێناو سەیری دایکمان کرد. دایکم بە پڕتاو گەڕاوە. چارۆکی سـەری خـزی. گرێـی لـە چـەکە پیناویەکـەی کرایەوە. لێفەی سەر چوار پای هەڵداوە. سەرما پژایە قاچەکانمان ، بە خێرایـی لـە ژێر چارپایەدا هاتینە دەرێ. ژێر دۆشەگە جوانەکە و گونیەکانی ژێری نۆڕی، بـەڵام دەستی سڕ و تەزیو هاتە دەرەوە. بە نینۆك رووی خۆی ڕنیەوە. جێ ڕنۆکی[1] ناسك لە دەموچاویدا پەیدا بوو. ژوورەوە پڕی پەرێشانی و ناخۆشی بوو. سەرینەکانی ئەم دیو و ئەو دیو کرد. ڕای کردە حەوشە چەند جار رێگای ژووری تا کەنار ئـاوی رۆخ بیرە کە نۆڕی. بە دوو دڵی گەڕاوەو بە گومانەوە سەیری ئێمەی کرد. کتێبـەکانمانی ئەم دیوو ئەو دیو کـرد. باولەکـەی قـوژبنی ژوورەوەی کـردەوە پـڕو پاتـاڵی نـاوی هەڵڕژاند.

گۆریـە خوریـەکانی هێنایـە دەرێ و ڕای تەکانـد. گرێـی لچـکی چـارۆکەکەی کردەوە، بەڵام جگە لە چەند دانە کشمیشێکی دەفعەل بەلا. شتێکی دی لـە نـاودا نەبوو.

بە مەزلومی نالاندی:

- یاحەزرەتی عەباس. یا دەفعەل بەلا. پێنج قران دەفعەل بەلا و دوو مۆمت بۆ لە خۆم دەگرم.

بۆ چەندەمین جار بـە دەوری چـوارپادا خولایـەوە. بـەم سەرماوسـۆڵە ، چـەند تنۆکێك ئارەقە لەسەر تەختی ناوچەوانیدا وەستا بوو.

---

١- ڕنۆك: جنجرۆك

خوێن لەلووتیدا نەمابوو لووتی درێژ ببوو. لە رۆخ قڵیشەکانی لێوی دەزوە دەماری شینی ناسك بەرجەستە ببوون. چاوەکانی پڕشنگیان تێدا نەمابوو. دانیشت ئاوی دەمی قوتداوە. بۆ دوا جار سەیری دەوروبەری خۆی کرد. بەرقەوە لێفەکەی لە سەر چوار پایەکەدا ڕاخستەوە. سەیرێکی پڕ لە پاڕانەوەی ئێمەی کرد. گریا و فرمێسکی هاتە خوارو نالاّیەوە:

ــــ ئازیزم مرد. ئازیزم لەبەر چاوانمدا کەوتە ئاوزنگدان. ماڵم وێران بوو. ئەی خوایە! ئەی خوای کەرو کوێر! بۆچی بەزەت بە منداڵەکانمدا نەهاتەوە. باشە خوایە من گوناهکار روو رەشم. ئەدی منداڵەکانم چیان کردبوو.

ها! نەزرت قبوڵ نەکردم. بەدبەختیمت نەدیت. باشە باوا بێ هەرسێکمان کەوتینە گریان. بەرق بە هاوار ، بەکینە ، بەشێوەیەك لە داخا هەڵدە لەرزیم لە ژێر لچکێکی لێفەکە هەڵتروکابووم و خۆم دەکوشی. قیژاندم:

دایە گیان چی روویداوە ؟! ئاخە چی بووە! ئەی دایکی بەد بەختمان!.

گەراوە جگەر سووتاو دەردەدار بوو. بە رووێکی خوساوەی ناو فرمێسك و ئارەقەوە ، بە لێوی ووشك و بێ رەنگ و برسیەوە نالاّندی:

ــــ ئازیزەکانم ، دەتانەوێ چیرووبدا. سێ تومەنی خەرجی ئیمرۆکەمانم ونکردوە. بەڵێ جگەر گۆشەکانم. بێ دەنگ بووین و دایکم بە قورگی پڕ خەم و گریانەوە ، دەستی بە چنینی دەورەی کلاّشێکی تازەکردبوو. ئاشورا پیسی و گواوی ناو خۆی ڕادەدا دەیشۆری و هەر پیستر دەبوو..

**چی روویداوە دایە گیان:**

شێوازی نووسینی عەلی ئەشرەف شێوازێکی زۆر تایبەتە ، ماوەی رووداوی کورتە چیرۆکەکانی زۆر کورت و چڕە ، وەك تابلۆییێکی پڕ لە رەنگی جوان جوانی لەگەڵ یەکدا گونجاو دێنە بەر چاو.

بۆ ئەمەش زمانێکی زۆر پاراو کە بۆشایی لە نێوان دەربڕینەکاندا نامێنێتەوە ، بەکاردەهێنی و لە کاتی خوێندنەوەیدا هەست بە گرێ و گۆلی کورت هێنانی دەربڕینی بابەتەکە ناکەی ، زمان کە چەکی کاریگەری نووسەرە لە هەموو بوارەکانی نووسیندا. لە شیعرو چیرۆك هەتا دەگاتە راپۆرتێکی رۆژنامەوانی.. هتد. لە هەر یەکەی شێوە بەکارهێنانی خۆی هەیە ، ئەمە جگە لە شێوەی زمانی شیعری یان هی هەر نووسینێکی دیکە. شێوەی بەکارهێنانی زمان لە لایەن کەسی شاعیریان نووسەرە کەوەش مەوداو جوانییێکی دیکە دەدا بە زمان کە پێی دەڵێن شێوازی شیعرییان هەر شتێکی دیکە.

جگە لە لایەنی زمان و بەکارهێنانی دەبێ باسی بابەتێکی دیکەی کە لێرە دەمەوێ بیورووژێنم ئەوەیە چی وا دەکا ئەم زمانە بە گەڕبکەوێ یان زمان چی دەردەبرێ هەموومان دەزانین بە بێ هاندانێکی ناوەخۆی کەسەکە کە جاری وا هەیە هەستێکی ناسکە ، قولّە ،ورووژاوە ، جاریوا هەیە

لە کاتی خوێندنەوەی چیرۆکەکانی ئەشرەف نەك هەر رووداوەکان تەواو بەرجەستە دەبن ، بەڵکە خوێنەر خۆی دەچێتە ناورووداوەکانەوەو لەگەڵیاندا دەژی و وەك پاڵەوانێکی نا دیار و بێلایەن لەگەڵ روداوەکاندا دێت و دەچێ. دایکێکی چەوساوە باوکێکی بێکار کاسەیەکی بە تاڵ کە ناخۆشی و نیگەرانی بۆ هەموو خێزانەکە لێدەکەوێتەوە دەبێ مرۆڤ چەند بەرگەی بگرێ.

نووسەر سەرەتا بە وەسفێکی گشتی. باری خێزان و گوزەرانیان دەست پێدەکا تابلوێیکی خەمناك دەنەخشێ کەوا لە مرۆڤ دەکا نارەزایی خۆی بۆ ژیان لەو هەلومەرجەدا دەربڕێ و ئامادەی بکا بۆ ئەو رۆژەی دەکرێ حسێب لەگەڵ ئەو کەسانەدا بکرێ بوونەتە هۆی دروست بوونی ئەو جۆرە ژیانە.

عەلی ئەشرەف لە روانگەی دایکیەوە بەرگری لە مافی ئافرەت دەکا ، چ وەك ئافرەت ، چ وەك ئینتمای بۆ چینێکی زۆر لێکراوی بەرادەییێك قێزەوەن کە جگە لە تێر کردنی سکی خۆی و منداڵەکانی ئاواتێکی دیکەی نییە.

(ئیتر باوکم وەك ئەو مرۆڤە ئاساییەی جاران نە دەما. کەزی دایکمی دەگرت و لە دەوری چوار پادا دەیسوڕاندەوە).

(زیرِە جگەر برِەکانی ئەسغەر هەمیشە لە گوێمدا دەزرنگێتەوە. ئـەو زیرِانـەی هەتا هەتایە بە بێداریم دەهێڵنەوە لە دژی ئەوانەی خەرجیان بە مفتە خۆری دێتـە بەر دەست) (لەدژی ئەو کەسانەی ناڵە ناڵی دایکم نابیستن ، لە دژی ئەو کەسانەی نەیانزانی و نەیانویست بزانن بۆچی هەمیشـە بـەری چـاوی دایکـم لـە دەردەداری مۆرهەڵگەرا بوو....... هەمیشە برسی بوو تا ئێمە تێربکا)

## نەدار

- نیاز عەلی نەدار.
- بەڵێ.

یەکەم جار کە بینیم لە تەنیشت لوولەی پلووسکی قوتابخانە دانیشتبوو. کۆخەی گرت. کۆخە کۆخ بە سەختی تەکانی دەدا. خوێنێکی کەم ڕەنگ پەڕیە رووی. دەمی بەسەر دەستی کورتەکەکەی سڕیەوە. بەخێرایی چووە پۆلەوە و لەسەر یەکەم کورسی دانیشت. پۆلی دووەم بوو. بچکۆڵەو وردیلە بوو ڕەنگی سپی وەك تریفەی مانگ بوو، دەماری ملی لەژێرپێستەوە دیاربوو ، وەك مرۆڤی نەخۆش و تادار دەمارەکانی هەڵدەپەڕین و لێیان دەدا. قەڵەمەکەی بە دەزوویەکەوە شەتەك دراو و ئاوێزان بوو کە کونی قۆپچەی کورتەکەکەیەوە بەستبوو. هەرکە شتێکی دەنووسی لەبەر ئەوەی داوە دەزووەکە کورت بوو ، سکی دەهێنا پێشەوە. هەروەك ئەوە وا بوو لە جیاتی قەڵەم ، لەشی خۆی لە ڕووپەڕی کاغەزەکە بخشێنێ. وەختێ کە نووسین و مەشقەکەییم لێوەر دەگرت ، دەستەکانی دەلەرزی. کاغەزی نووسینەوەی نەبوو لەناو تەنەکەی زبڵ کاغەزی بۆ خۆی پەیدا دەکرد.

کە هێڵم بەسەر نووسینەکەیدا دەهێنا ، وام هەست دەکرد کە هێڵ بەسەر رووپەریدا دەکێشم. نیوەڕۆیان نە دەچووە ماڵەوە لە ڕاستیدا زۆربەی منداڵان بۆ ماڵ نەدەچوونەوە. بەرماوەی نانی شێوی دوێنێیان ، هەر لە هەمان شوێن لە رۆخ دیوارە قوڕینەکەی قوتابخانەدا دەخوارد.

ئەویش تێشووی نیوەڕۆی لە باخەڵدا بوو. پێڵاوە لاستیکەکەی هێڵێکی قرمزی ڕەنگ ناشیرینی لەسەر پێیدا کێشابوو شوێنەواری برینی جێهێشتبوو.

وانەکانی باش دەخوێند. زووتر لەوانی دیکە کەوتبووە خۆو بە باشی دەیتوانی نووسینە درشتەکانی سەر لاپەڕەی ڕۆژنامەکان بخوێنێتەوە. ڕۆژێکیان لە کاتێکدا هەمووومان. بێدەنگ بووین ، خشە خشی ئەو ڕۆژنامەیەی کە لە جیانی شووشە بە پەنجەرەکانەوەمان گرتبوو. سەرنجی منداڵەکانی ڕاکێشا.

بە نیاز عەلیم وت:

((نیاز عەلی دەتوانی ڕۆژنامە بخوێنیتەوە ؟ ها ، بەڵکە بزانی چی نووسراوە ؟ ))

پاشی کەمێك سوور هەڵگەڕان و منە من کردن ، دەستی بە خوێندنەوە کرد.

ـــ ((مامۆستا نووسراوە چاکەتی ))

ـــ ئافەرین ، ڕاستە ، دەی بخوێنەوە ، باشە.

ـــ مامۆستا دوو سەدو پەنجا هەزار تومانی.

ـــ ئافەرین ، ئافەرین. زۆر باشە بەردەوام بە.

مامۆستا ، لەتاراندا هەڕاج کرا.

هەناسەی تازەکردەوە. ڕووی لە من کرد و ووتی ((مامۆستا چەند گەورەو باش و درشت دەنووسن.

* * *

- نیاز عەلی نەدار.

- بەڵێ.

نازناوی (نەدارەد) بوو لە پۆلەکەمدا زۆرلە منداڵاّن نازناویان (نەدارەد)بوو. وەختێ کە ناویم دەخوێندەوە تەکانێکی بە هێزی دەدا ، بەشەرمەوە ، لە حاڵێکدا کە قەڵەم و دەزووەکەی دەشاردەوە تا نەیان بینم ، بە دەنگێکی کزەوە دەی وت: بەڵێ لێرەم و لەو کاتەدا دەنگی لە بێچووە قەلێك دەچوو کە لە ناو لەپدا بیگوشی. تاکە شتێك کە ئەو یاری پێدەکرد تۆپێك بوو لە کاغەزی ڕەشی تۆپەڵ کراودا دروستی کرد بووە و منداڵەکان یارییان دەکرد ، ئەو لەبن دیوار دادەنیشت و تۆپەکەی لەناو دەستدا دەگوشی.

سەیری ئاسمانی دەکرد بە حەسرەتەوە چاوی لە یاری کردنی منداڵەکان دەبڕی. هەر وەختێك یاری دەکرد ، کۆخەی دەگرت و ڕەنگی سور هەڵدەگەڕا.

* * *

حەزم دەکرد زیاتر قسەی لەگەڵدا بکەم. ڕۆژێك لەسەر قادرمەی قوتابخانە دانیشتبوو ، لەسەرەخۆهات و لە ڕۆخ قادرمەکەوە دانیشت. تۆپەلە کاغەز دروست کراوەکەی لە ناو دەستدا بوو. سەرچۆکە چڵکنەکانی لە دوو تویێی شەرواڵە دڕاوەکەیدا بە دەرەوە بوو. پرسیم: ((نیاز عەلی ماڵتان لە کوێیە ؟))

ـــ مامۆستا لە پشت قەڵایە.

ـــ باوکت چییە ؟!

ـــ ڕیش سپی ، مامۆستا.

چ کارەیە ؟.

ـــ پەکی کەوتووە ، مامۆستا. زۆر پیرە ، لە ماڵ دانیشتووە و کتێبی دوعا دەخوێنێتەوە ، مامۆستا.

ـــ دایکت چی دەکا ؟

ـــ پەکی کەوتووە ، مامۆستا دوێنێ ددانەکانی پێشەوەی کەوتن و پەکی کەوت.

کە بە باشی لێم کۆڵیەوە، بۆ دەرکەوت کە دایکی بۆ ((مش باقر)) بازرگانی میوەی وشککراوە کاریکردووە. ئیشی شکاندنی پستە بووە. ئەم پستانەی کە دەمیان نەکرابوو ، بە ددانەکانی دەیکردەوە و ڕۆژی بیست و پێنج ڕیاڵی وەرگرتووە. پاشی ساڵانێکی زۆر کار کردن ، ددانەکانی کەوتوون و پەکیکەوتوە. برا گەورەکەی گڵ هەڵکەن بووە دوو ساڵ پێشتر پاش گەڕانەوەی لە سەربازی لە کاتی کار کردندا کەوتۆتە ژێر خاك و خۆڵی بانێکی بەسەردا تەپیوەوە ئەوانی تەنیا جێ هێشتبوو.

زستان داهات ، منداڵان لە دێهاتی دوورەوە ڕادەهاتن. وەختێ کە دەگەیشتنە قوتابخانە هەر لە مرۆڤی بەفرینەیان دەکرد. سەر و برژانگ و ئەبرۆ و کونە لووتەکانیان بەستبووی. کە برژانگەکانیان دەترووکاند ، وەکو ئەوەی دوو پارچە

شووشه پێکدا بدەن. چق چق دەنگی لێوە دەهات لە ڕۆخ زۆپا دارەکەدا دادەنیشتن و پارچە شەختەیان لە لووتیان دەکردەوە. ئەوانەیش کە سمێڵیان (گوگرە)[1] کرد بوو و قوتابی پۆلی بەرزتر بوون ، سمێڵی شەختەیی گەورە لەسەر لچیان دروست دەبوو. کلاشە ژێر لاستیکە سووتاو و بۆنی تیژی عەرەقەی پێیەکانیان لە هەوادا بلاو دەبووە. لەم لاو ئەو لای کلاش و پێلاوە لاستیکەکانیاندا ئاو دەچۆڕاوە و دامەنی زۆرپاکەی تەڕدەکرد.

* * *

ژوورەکەم لە تەنیشت پۆلی دەرسەوە بوو. هەموو بەیانیان لەپەنجەرەوە منداڵەکانم دەدیت کە دەهاتنە قوتابخانەوە نیاز عەلی وەك مەلێك داویان لە قاچ بەستبێ ، خۆی بەرەو قوتابخانە هەڵدەکوتا. کەوانەکانمان تەواو دەبوو داوام لە قوتابییەکان دەکرد بێنە پێشەوەی پۆلەکە و چیرۆك بگێڕنەوە. هەندێ وەختیش دەموت هەر کەسێك خەونێکی باش و سەرنجڕاکێشی دیووە بیگێڕێتەوە.

ڕۆژێکیان سەرە گەیشتە سەر نیاز عەلی. یەکەمجار نەختێ خۆی هێناو برد. بەلام لە دواییدا هات. لە حاڵێکدا کە سورایی جێ برینەکەی ڕوومەتی پەڕییە ڕووی و بە دەنگی لە رزۆکەوە دەستی بە گێڕانەوە کرد:

((خەونم بینی ببوومە چۆلەکە، هەر فڕیم.. فڕیم. لەسەر بانەوە بۆ ناو حەوشە هەڵفڕیم. لە حەوشەوە فڕیمە سەر تاقی پەنجەرە، باوکم ووتی: ئەی داد و بێداد ، منداڵەکەمان بووەتە چۆلەکە. من دیتم کە باوکیشم بووە چۆلەکە ، من دیتم کەباوکیشم بووە چۆلەکە و چوو لەسەر کتێبی دوعاکەیدا هەڵنیشتەوە. دایکم یەکەمجار پێکەنی. پاشان گریا. لە پڕێکا ئەژدیهایەکی گەورە هاتە ماڵەوە. دایکم کە ئەژدیهایەکەی بینی وتی: وای وای خوایە ((مش باقر)) هات! خێرا خێرا پستەی لەناو کۆشی دەرهێنا و دەمی لێك کردنەوە. بینیم کە دایکم ددانی نییەو خوێنی لە

---

١- گوگرە: ئەوی تازە سمێڵی بۆردەکا

دەمەوە دێ. ویستم بچم و چاوی ئەژدێها دەربهێنم. فستقێکیان پێکەنی و وتــی: ـــ دەرهێنانی چاوی ئەژدیها هیچ سوودێکی نییە: ئێمە ئێستا کارێکی وا دەکەین کە لە داخا شەق بەرێ. هەموو بســتەکان پێکــەنین و پاشــان پێکــەوە دەمــی خۆیــان وێــك هێناوە. ئەژدیها چووە ناو عەماری فستقەوە و بینی کە هــەموو فســتقەکان دەمیــان بەستراوە. ئەژدیها بە ڕقەوە وتی:

ئەی بستەکان ، ئێستا بابتان لە گۆڕ دەردەهێنم. چوو دەستیدا کوتکێك تا بەسەر و کۆپەلاکی بستەکاندادا، ژێر قاچەکانی پڕی لە ددان بوو پێــی لەســەر ددانەکانــەوە هەڵخزی و سەراو سەر کەوتە سەر زەوی. (مش باقر) خۆشحاڵ بوو ، بەڵام فستقەکان بە یەکیان وت: ئەژدیها کاری پێکەونیناوی دەکرد بۆ بە پێکەنین هێنانیان. ملی درێژ دەکرد تا دەگەیشتە ئاسمان و ئەســتێرەکانی دەخــوارد. تەقڵــەی لێ دەدا. چــاوەکانی دەقوچاند و ئەستێرەکانی لە گوێی دەردەهێنــاوە. مــن پێکــەنین گرتمــی. بــە دەنگــی پێکەنینەکەم ئەژدیها گەڕایەوە منی بینی و وتی: ها.. ئەم ئیشانە هەمووی لە ژێــر سەری تۆدان. لە(هیکڕا)[1] شالاوی بۆ هێنام. ویستم لە پەنجەرەوە بۆی دەرچم. پەنجەرە وێك هاتەوە و تەنگ بووە فستقێك لەوێ کە نزیکی من بوو وتــی. وەرە لەســەر مــن دانیشە تاکو هەڵبێین. فستقەکە وەك بالۆنێکی لێهاتبوو. منــیش لەســەری دانیشــتم بالۆن منی لە کونی لوولەی زۆپاوە بردە دەرێ تــا گەیشــتینە ئاســمان. حــەزم دەکــرد ئەستێرەیەکی جوان بۆ دایکم ببەمەوە تا لە ملی بکا ، بەڵام لە پڕێك قاچــم خــزی و بینیم کە باوکم قوڕوکا بۆ سەربان ئەشێلێ. سەراو سەر کەوتمە ســەر قوڕوکایەکــەوەو لەشوێنی خۆم ڕاپەڕیم. بینیم کە بنمیچی بانەکە بەسەر سەرمدا دلۆپە دەکا ))

منداڵان هەموویان پێکەنین و چەپڵەیان بۆ لێدا. وەختێ کە چوو دانیشێتەوە. وەك مراوی خنجیلە بوو کە بەرەو هێلانەکەی ڕابکا.

---

١- هیکڕا: لەناکاو

زستانی ئەو ساڵە لە ساڵەکانی پێشتر ساردتر بوو. پەنجەرەکانمان بە ڕۆژنامە و مقەوا چاك گرتبوو. ڕۆژێکیان بەیانی ناوی قوتابییەکانم دەخوێندەوە تا ئامادە و نەهاتووەکان بنووسم:

ــــ ((نیاز عەلی نەدار))

چەند منداڵێك لەسەرەخۆ وتیان: ــ ((نەهاتووە))

ڕاچەنیم. جێگاکەی چۆڵ بوو. خەمێکی نا ئاشنا لە دەمووچاوی منداڵەکاندا دەبینرا. هەموو سەریان لەبەر خۆیان نابوو. هۆی نەهاتنەکەیم لە چاودێری پۆلەکە پرسی. وتی: مامۆستا ، دوێنێ دەمە دەمی ڕۆژئاوا بوو مرد. مامۆستا ، لەسەرما ، خوێنی لە قوڕگی هات و مرد هەر دەیوت، ئەستێرەم دەوێ ئەستێرەم دەوێ ئەستێرەیەکی جوان بۆ دایکم.)) منداڵەکان بێ دەنگ بوون. باڕۆژنامەی ڕووی پەنجەرەی پۆلی دەهێنا و دەبرد ویزەویزێکی لێوە دەهاتە بەرگوێ. وەك ئەمەی کە نیاز عەلی لە ڕێگای دوورەوە چیرۆکی دەگێڕایەوە یان خەونەکانی دەگێڕایەوە. دەنگی ئەو وەختەییم هەر لە گوێ بوو کە ڕۆژنامەی دەخوێندەوە.

پەڵە هەورێکی ڕەش لەسەر سنگی ئاسمان بوو هەموومان بێ دەنگ بووین. چاوم بە ڕۆژنامەیەکی تازەکەوت کە بەر پەنجەرەوە بوو. بە نووسینێکی گەورەو درشت نووسرا بوو: ((بیمەی تەندروستی بۆ هەمووان ))

# کورتە چیرۆکی نیاز عەلی نەدار

وا دەردەکەوێ کە جگە لەوەی مندالّەکە نەخۆشە ، لە خێزانێکی زۆر دەستکورت و هەژارە. واتە هەژاری و نەخۆشی یەکتری تەواو دەکەن و پەیوەندییێکی توند و تۆڵیان بەیەکەوە هەیە. چونکە دایك و باوکی دوو کەسی پەککەوتەی مالّەوەن ئەو پستە و فستقانەی کە خەڵکی لە جێوە دەیخۆن. ئەوان و هەزارای وەك ئەوان بە زەبری فشاری ددانەکانیان دەمی توێکلّە رەقەکەیانیان کردۆتەوە کە تەنیا کاری دەزگا و ئامێری لە ئاسن و پۆلاً دروست کراوە. ئەو دایك و باوکە بەستە زمانە لە هێز و بڕشت کەوتووتن و بێ دەم و ددان لە مالّەوە خەریکی خوێندنەوەی کتێبی دوعان هەر بۆ ئەوەی خوا لە برسان نەیانکوژێ و غەزەبیان لێنەگرێ.

لە هەمووی ناخۆشتر ئەوەیە برایەکی گەورەی هەبووەو دوای گەڕانەوەی لە خزمەتی سەربازی گلّ و خۆلّی سەربانی کۆنە خانووێکی بەسەردا تەپیوە و قوربانی حازریان بووە.

مامۆستاکەی هیواییێکی بەو کوڕە چکۆلانە هەیە کە لە ئێستاوە دێرە گەورەکانی (مانشێتی) رۆژنامە دەخوێنێتەوە کە نووسراوە لە تاران (چاکەتێك بە (٢٥٠) هەزار تومەن هەراج کراوە ، لێرە جیاوازییە گەورەکەی نێوان ژیانی خەڵکی لادێ و شار بە دەردەخا کە سەیر لەوە دانییە چاکەتێك گرانبە هابێ بەلّکە سەیر لە کلۆلّی و نەداری

نیاز دایە کە شەوێکی زستان بەو هەموو برسێتی و نەخۆشیەوە دلۆپەی بنمیچی بانەکەشی بۆتە هۆی ئەوەی خەوی ناخۆش ببینێ. تەنیا خەویشی وەك مرۆڤێکی ئاسایی نیە ئەو مندالە لە هەموو لایەکەوە زۆری بۆ هاتووە بۆیە مندالان یاریدەکەن ئەو لاتەریك لەژێر دیوارەکەدا دەوەستێ و سەیری مندالان دەکا و ناتوانێ یاریان لەگەڵدا بکا ، کە مندالێك کە لەو هەلومەرجە ناخۆشەی ژیاندا بژیێ چاوەڕێی شتی خراپتریش دەکرێ ، ئەویش ئەوەیە کە سەر لە ئێوارەی رۆژی پێشو مردووە.

نووسەر دەیەوێ بە هێزی بەرەی نا حەزی بە مرۆڤ بلێ دەی دلت ئۆخەی بکا ئەوا دوژمنێکت، مندالێکی زیتی مالە هەژارێك بەستە زمانێکت لە کۆل بۆوە تۆش بزانین بە دامرکاندنەوە حەزە دڕندەیی و ناکەس بەچیەکانت درێژە بدە ، مێژوی مرۆڤایەتی بە نەخۆشی و نەداری کەسانی دیکەی هاونەژادت بڕازێنەوە، دەبێ هەر دۆلی: ((تەئمینی تەندروستی لێی دەی))

## ماڵی ئێمە

(ئاشورا) جیٚ ی تۆ پینی پیرە سەگەکان بوو. شوێنی عیشقبازی مراویان بوو. جێی بێچووە پشیلە فرێدان بوو کە خەویان لە خەڵکی حەرام کرد بوو ، ئاشورا شوێنی یاری کردنی ئێمە بوو.

سەرەتای بەهار یا خود دوا دوایی پایز کە هەوری رەش ئاسمانی دادەپۆشی ، باوکم لە ژوورەوە دەناڵایەوە و دەیوت.

ـــ خوایە لە غەزەبی خۆتمان بە دوور بگرە.

بەلاٚم خوا گوێی نەدەدا قسەی باوکم. لافاو دەهات. ڕقی هەڵدەستا.

دنیای دادەشۆری و دەڕۆیشت. دەستی بە دەم و لێوی دادەهێنا.

پردە دارینەکانی دەبرد. بە خانووەکانی سەرەوەی شار نەدەوێرا چونکە لەبەرد و گەچ دروست کرا بوون. بەلاٚم کە دەگەیشتە ئێمە هەموو دیقی دڵی خۆی پێدا دەڕێژتین. دیوارەکانی بە هێلانە چۆلەکەوە دەبرد.

لافاو تا ناو ژوورەکەمان دەهات. وەك میوانی ناوەخت و مشە خۆر دەماوە. سەری لەباول و گۆسکەی دیزەی ماڵەوەمان دەدا کتێبی دوعاکانی باوکمی دەخوساندەوە. باوکم دەیوت:

ـــ ئاشورا دەڵێی مەئمورە. سەر بە هەموو کون و قوژبنێك دادەگریٚ.

گەلێ ئاوەڕۆ و نۆین لە ئاشورایان دەکردەوە. زبڵیان دەڕێژتە ناو ئاشورا. کە لە سەرەوەی شارەوە دادەڕژا خوار ، باری خۆی دەهێنا تا دەگەیشتە بەر دەرگای ماڵی ئێمە. هەموو باری خۆی لەسەر گردەکەی ئێمە دادەگرت. لافاو هەموو شتێکی لەگەڵ خۆیدا دەهێنا کورتانی ولاّغ لە دواییدا ولاّغەکان خۆشیان لەگەڵ لافاو دەهاتن.

کاریتەی گەورە. رەگ و کۆلکی دار و درەخت. کا و گەنمی گوندەکانی دەورو بەریشی دەهێنا گا و مەڕو مالاّت. باعە باع و گریانی دەهێنا.

هات و هاواری دەهێنا. گەلێ قوتوشی لەگەڵ خۆیدا دەهێنا کە وێنە ماسیان لەسەر بوو. وێنەی ژنی ئێسك سووکیان لەسەر بوو جارێکشیان شڕە لانکێکی بە کۆرپەڵەکەوە هێنابوو کە هێشتا کورپەڵەکە دەیواقاند. لافاو پردە دارینەکانی وێران دەکرد پردە بەردینەکانی لەشوێنی خۆیان نەدەجوولاند. تاکو پردەکان دروست دەکرانەوە ئێمە هەمیشە دەرنگ دەگەیشتینە قوتابخانە و دارکاری دەکراین.

کە لافاو دەنیشێتەوە ، ئاشورا وەك جاران میهرەبان و بەخشندە دەبووە دووبارە (شەفیعە کۆر) بە شمشاڵە ئاسنینەکەی لە رۆخ دیوارە تەڕ و شێدارەکان لەبەر بەرۆچك دادەنیشت. ئاشورای پڕ لە ئاواز و گۆرانی کوردی دەکرد.

شەفیعە کوێر هەمیشە لە دەور و رۆخی ئاشورا بوو. قەلەڕەش چاوەکانیانی کۆڵی بوو. دایکم دەیووت ((کە مندالڵ بووە. زۆری نارِحەتی کردوە ، چوەتە سەدار تا بێچوە قەلەڕەش بگرێ. قەلەڕەشیش ڕژاونەتە سەر سەریەوە و چاوەکانیان بە دەنووك دەرهێناوە. )) بەلاّم شەفیعە کوێر بە نەخۆشی (ئاولّە) کوێر ببوو. پاش نیشتنەوەی لافاو دەچوینە ناو بەستە چەگڵیەکەی ئاشورا کە رەش ببوو دەگەڕاین و پارەمان دەدۆزیەوە و ملاّك و بوتڵی شکاومان دەدۆزیەوە. جارێکیشیان ئاو لە ناوەڕاستی شاردا دوکانی چاوێلکە فرۆشێکی برد بوو ئێمە چەند چاوێلکەمان دۆزیەوە.

ڕۆژێك بوتڵێكمان دۆزیەوە وێنەی ژنێكی كەژاڵ و خوێن شیرینی لەسەر بوو. هەر كاتێك باوكم تەماشای دەكرد. بە تیلەی چاو سەیرێكی دایكمی دەكرد و لەسەرەخۆ بە شێوەیەك كەدایكم گوێی لێ نەبێ دەیوت: ـــ

ـــ هە های هەی! لەدنیادا شتی چەند سەیر هەیە.

پاشدان بوتڵەكەی بۆن دەكرد و دەیوت:

ـــ ئاە! ئاە! پیف! نەعلەت لە كردارت.

بوتڵەكەی تورِ هەڵدەدا بەلاّم رۆژی دوایی سەر لە نوێ ئەم كارەی دووبارە دەكردەوە. شیشۆقی[1] ناو چەگڵەكە دەست و پێمانی دەبڕی. لەسەرەخۆ دەهاتین و خۆڵەمێشی كوورەی حەمامەكان لە دەم ئاشورا فڕێ دەدرا بە برینەكانمان دادەكرد. ئاومان لەو كانیانە دەخواردەوە كە لە رۆخ ئاشورادا هەڵدەقوڵێن. دەچوینە رۆخ مشكییە[2] گەرمەكان لە تەنیشت یەك ڕادەوەستاین سەیری سوورایی ئاگر و سەوزایی لاستیكە سووتاوەكانمان دەكرد، لەسەرەخۆ دەچووینەوە ماڵ و نانمان دەدزی و تا دایكم لە ناكاو نەمان گرێ لە ناو پزی دەرپێمان دەنا. كاتێ كە لە ژوورێ دەهاتینە دەرێ، دەستەكانمان بەسەر بەستی رادەوەشاند و مانای ئەوە بوو كە شتێكمان نەبردوە. بەلاّم خۆمان نەدەجوولاّند نەبادا لێمان بكەوێ ، ئەگەر دایكم دەیدیت بە قونجركە ناو ڕانەكانمانی شین و مۆر دەكردەوە. دەینالاّند و سەری خۆی بە دیوار دادەدا. لە قوژبنێكی ژوورەوە دادەنیشت. دەستی لە ئەژنۆكانی وەردەهێنا. خۆی بە ڕاست و چەپدا ڕادەژاند و توكی[3] دەكرد دەیوت:

---

١- شیشۆق: شووشە شكاو

٢- مشكی: خۆڵەمێش

٣- دەقەپاند: دەڕفاند

ـــ وای له خۆم ماڵوێرانیٚ و هەڵکوچاو له پای دیواران ، وای بەدبەخت خۆم ، له گۆڕی ئەو کەسه ڕیم منی به شوداوه ڕۆڵه ، ئیلاهی مەرگتان ببینم شین و شەپۆڕتان بۆ بکەم.

مەمکەکانی بەرەو قاپی ئاسمان دەگرت و دەیوت.

ـــ تا رۆژی قیامەت شیرم لێتان حەرام بیٚ.

لەم کاتانەدا ئەکبەر ئاو له کوونه لوتی دەهاته خوار و به بوغزەوه دەیوت:

ـــ کاشکی دەبوو مرۆڤ هەر نانی نەخواردبا. تا دایکم خۆشحاڵ بیٚ نارِحەت نەبیٚ.من دەموت:

ئاخه نابیٚ ، ئەو کاته دەمرین!

ئەکبەر دەیوت:

که دایکم ئێمەی بەسەر گەشتەیی و مەزلومی له پای دیواردا دەدیت.

دڵی پێمان دەسووتا. له پڕمەی گریانی دەداو دەیوت:

ـــ ئاخر رۆڵه بۆچی ئەز یەتم دەدەن. ئاخر شەو چ وەلاٚمی ئەو سەگبابه بدەمەوه ؟

سەگباب ، باوکمان بوو. ئێمەش لەگەڵ دایکم له پڕمەی گریانمان دەدا. هەر وەختێك منداڵێك له منداڵەکانی کۆلاٚنەکەمان دەمرد. دایکم تا چەند رۆژ نەفرەت و دوعای لێنەدەکردین بەڵکه ماچیشی دەکردین. له باوەشی دەگرتین و قوربان و بەراگێڕمان دەبوو. رووی له ئاسمان دەکرد و دەیوت:

ـــ رۆڵه گیان ، عەزیزەکانم دەردی ئێوه بێته گیانی من.

بەلاٚم لەگەڵ یەکەم پاروەنانی له ناندین دەماندزی، ناڵە و نەفرینی دەستی پێدەکردەوه. له کولانه هێلکه مان دەدزی دەمان هێنا و لە ژێر خۆڵەمێشی داغی کوورەی حەمامەکانمان دادەنا و تا دەبژا. هەندیٚ جاریش هێلکه له ژێر خۆڵەمێش دەتەقی و مشکی به ناو دەموچاو و قوڕگماندا دەپڕژاند. ئەگەر چنگیشمان بکەوتایه چەوەندەریشمان دەخسته ژێر خۆڵەمێش و لێکمان دەقەپاند.

ئاشورا بە بۆنی ئاودەستخانەکانیەوە جێگای ئێمەی لە باوەشی خۆیدا دەکردەوە ، بەسەر ئەو لوولە بۆڕیانەی ئاویان بۆ ماڵە گەچ کاری کراوەکان دەبرد. یاری (بەردی من لە دەستی تۆ)[1] مان دەکرد خانیچکۆلەمان بۆ پشیلە بێ دالّدەکان دروست دەکرد. لە دەوری شەفیحە کوێردا دادەنیشتین و گوێمان لە ئاوازەکانی دەگرت. شەو ماندو مرد و بە سەر و رووێکی خۆڵ و تۆزاوی و دەستی پڕ لە قەلّش و خوێناویەوە دەخزاینەوە ماڵ. بەدوو دلّیەوە سەلامان لە دایکم دەکرد کە لە ژێر چوارپا دانیشتبوو. دلّمان دەکەوتە کوتە کوت لە ترسی ئەوەی ئایا دایکم سەری لە ناندین داوە یان نا ؟. ئەو کە دەستەکانمانی دەدیت بە سەر و رووێکی میهرەبان خوی دەنواند بەلاّم لەڕاستیدا بە بوغزو کینەوە دەیوت:

ماڵمان وێران بوو هەر پارە و پولێکمان هەیە دەبێ بە وازەنینی بدەین بۆ دەست و پلیان. بوون بە کرێ گرتەی شەیتان لە بەیانیەوە تا ئێوارە ئیش دەکەین ، ئێوارەش هیچ دەسکەوتێکمان نییە.

لافاو هێلّێکی بەنیشان لەسەر رووی قەدی دیوارەکانی ژوورەوەمان بەنیشان بەجێدەهێشت. باوکم دەیزانی پارو چەند ساڵ پێشتر لافاو تا چ ڕادەیەك و چەند هەڵسا بوو شونەواری لەسەر دیوار بە جێ ما بوو. باوکم دەستی بۆ دیوار درێژ دەکرد و دەیوت:

ــــ ئەمەش سالّنامەی دیواری ئێمە.

لافاو دەهات. ئاشورا پڕ دەبوو و ئاو لە ئاودەستخانەدا بە کوفارە سەردەکەوت. حەوشەی پڕ دەکرد. بیری پڕدەکرد تەختە ڕزیوو کاو چەپکە گوڵی سیسی لەسەرەوەی شاردا بە دەستەوە دەگرت و دەیهێنا ناو ژوورێ و پێشکەشی دەکردین. تەنیا زمانی نەبوو سەلامان لێبکا. کلیممان لول دەدا. شەرواڵمان هەڵدەکرد. نافەکمان تەڕ دەبو و شلّپە شلّپی دەهات دایکم چارۆکی لە دەوری کەمەری گرێدا بوو پێیە سپیەکانی لە ناو ئاودا دەلەرزی و خێرا خێرا سەلّەواتی

1- بەردی من لە دەستی تۆ: وا دیارە جۆرە یاریەکی منداڵانە.

لێدەدا و دەیوت. ئێستا ئاو دنیا دەبا. لافاوی نووحە. بەدبەخت و خانە خراپ بووین ، ئەی خوایە لە قاپیتدا سەگێکی گوناهکارین. بەزەت بە منداڵەکانماندا بێنەوە. سەری بۆ ئاسمان بەرز دەکردەوە و دەیوت:

ـــ ئۆۆۆهـــ...! خوایە لە دەرگاتدا سەگێکی روو رەشین

ئەکبەر زۆر بزۆربوو سەری بۆ ئاسمان بەرز دەکردەوەو دەیوت:

ـــ میاو میاو میاو! ئەی خوایە بێچووە پشیلەین لە قاپیتدا.

دایکم تووڕە دەبوو دەیوت: کە منداڵی وەکو ئێوە سەرتان لە قەپێلك جوقاند دنیاتان وێران کرد. ئاخیر زەمانە. گوایە دەمانەوێ خوا لەمە خراپترمان بەسەر نەهێنێ ؟ بە خوا ئەگەر ئاگریش بباریێ هەر کەمە.

من دەمزانی کە ئاو دنیا نابا. ئاو تەنیا خانووە قوڕەکان دەبا. زۆر رۆژان خۆم بە ناو ئاشورادا تا ئەو سەری شار رۆیشتبووم ئاو خانووە گەچ و بەرد کاریەکانی نەدەبرد. کە لافاو دەنیشتەوە. لەناوەڕاستی ژووریێ ئەو کاغەزە رەشانەمان دەسووتاند کە لە کۆلاَنان کۆمان دەکردنەوە. دەرگامان دادەخست تاکو ناو ژوورەکە گەرم دابێت و وشك بێتەوە ، پاشدان دەچووینە لای دراوسێیەکەی قاتی دووەممان چونکە ئاو ئەوانی نەدەگرتەوە. نان و هەرچییەکمان هەبایە لەسەر یەکمان دادەناو پێکەوە دەمان خوارد. باوکی ئەوان حەماڵ بوو باوکم لەگەڵی دادەنیشت و هەر دووکیان پێکەوە باسی بێکاری و رۆژگاریان دەکرد. باوکم لە رۆخ مەقەڵەکەیان دادەنیشت. بێ پسانەوە بەڵغەمی سنگی لەناو مشکیەکانی دامەنی مەقەڵەکە دەکرد و خۆڵەمێشی بە سەردا دەکرد. دایکم لەبەرە خۆیەوە بۆڵە بۆڵی دەکرد.

هەناوت رزێ ئیلاهی. مەقەڵەی ئەم ماڵەت پر لەتف و بەڵغەم کرد. دایکم لەگەڵ ژنە دراوسێ کەماندا کلاشیان دەچنی و دەردی دڵی خۆیان بۆ یەك هەڵدەڕێژت.

من و ئەکبەر لەگەڵ کچە دراوسێکەماندا کە بۆن و بەرامەیەکی خۆشی لە ژێر چارۆکەکەیەوە دەهات و سەری نینۆکەکانی بە چنینی کـلاش ریشـاڵ ریشـاڵ ببوو پێنج بەرد و کانێمان دەکرد[1]. بۆ نووستنیش دەچووینەوە خـوارێ. کاغـەزە سووتاوەکانمان فڕێ دەدا دەرەوە و لەسەرزەوی گەرمدا دەنووستین. هەندێ جاریش ژوورەکەمان تێکدەچوو لایەکی دەتەپی و ساپیتەی دەهاتە خوار. ئەم جۆرە کاتانە ، تا چەند رۆژ لە کۆڵانەکانی هەر دوو بەری ئاشورا بە دوای خانوودا دەگـەڕاین. دایکم و باوکم هەریەکەیان بڕ و بزگوڕێکیان لەگەڵ کەلوپەلی و پەلی ماڵەوە بـە دەستەوە دەگرت و سەرمان لە مالاّن خوار دەکردەوە و لە ژووری کرێمان دەپرسی. دایکم رووی خۆی بە چارۆگەکەی دادەپۆشی. سەری لەتی دەرگای حەوشە دەبردە ژوورێ. بە دەنگێکی پڕ سۆزەوە بانگی دەکردن

ـــ باجی توخوا ژووری بە تالّتان نییە بۆ کرێ ؟!

خوا خێرتان بنوسێ.

لەم وەختانەدا باوکم سەر و رووێکی پڕ لە ئومێدی نیشاندەدا هەناسـەی لـە سنگی خۆی بەند دەکرد و چاوەڕێی وەلاّم دەبوو دلّمان تەپـە تـەپی دەکـرد ، بـە چاوێکی کز و بێ رۆشنایی تەماشای دەرو دیواری مالّەکەمان دەکرد. بـەلاّم لـە زۆربەی کاتدا دەنگێك لەناو حەوشەوە وەلاّمی دەدایەوە:

ـــ نا خوشکێ ژووری بە تالّمان لە کوێ بوو ، ئێوە سەدەمین کەسن لە ژوور دەپرسن. ئاخە ئێمەش موسلّمانین ئیش و کارمان هەیە. لچ و لێوی دایکـم شـۆر دەبوو. لووتی فن دەکرد و بە لچکی چارۆگی دەسڕیەوە و دەیووت:

ـــ تف لە گۆڕ و مەزەبت.

هەلّی دەکوتایە سەر من و ئەکبەر و دەیوت:

ـــ پەپوینە ، قەدەم بێ خێرینە.

---

١- پێنج بەردوکانی: یاریەکە زیاتر کچۆلە دەیکەن ، پێنجوکانێشی پێدەلّێن.

هەڵدەهاتین و بەڵام دوور و نزیك بە دوایاندا دەڕۆیشتینەوە. لافاو تەواو دەبوو سەر لە نوێ ئاشورا ژیانی دەهاتەوە بەر.

دووبارە پیرە سەگ لەم لاو ئەو لادا دەتۆپین. منداڵ و پیرە مێرد و پیرە ژن بە خۆیان و کیسە درێژەکانی ملیانەوە. بە کۆڵانانـدا دەگـەڕان و بـە دوای بـژیودا سواڵیان دەکرد. وردکە چەگلە رەشەکانی رۆخ ئاشورایان وەرگێڕ و داگێڕ دەکـرد. خەڵکی دەهاتن گونیەی پڕ بێچـوە پشـیلەیان لەسـەر گوفەکـەکانی دەوروبـەری ئاشورا بە تاڵ دەکرد. تاکو ئێمە دووبارە بیان بەینە ماڵەوە و مراویەکان بە قیڕە و قاژەوە عیشقبازیان دەکرد و پێك دادەفسین تاکو کەنار ئاوەکانی ئاشورا پڕ لە جووجەڵەی زەرد و ئێسك سووك بکەن.

هەموو تەنگەی ئێواریەك شەفیحە کوێر شمشاڵەکەی لـە بـن هـەنگڵی دەنـاو دەچۆوە ماڵ و ئاشورای بە سارد و سڕی تەنیا جێ دەهێشت.

# دوو ماسی لەناو نوقڵدان

وەك هەموو پێنج شەممەیەك خامۆش و دڵگیر بوو ، كە مێكـێش خۆشـی پشـووی رۆژی هەینی پێوە دەبینرا ، ئاخە لێوەی پایز بوو. هەفتەیـەك پێشـتر لافـاو هەڵسـابوو ، هێشـتا ژوورەكەمان نێمی مابوو باوكم لە ژێر چوار پایەدا نووستبوو.

تیشكی هەتاو لەسەر رووی دیوارە قورِینەكەی حەوشەی دەدا، حـەزم دەكـرد خـۆر ئـاوا نەبێ. هیچ ئاوا نەبێ و ئەرك و دەرسـەكانم خۆیـان لـە خـۆرِا بنووسـرابانەوە و بـاوكم هـەر نووستوباو قەت بە ئاگانە- هاتبا هەركە هەڵدەستا ، پەڵپی دەگرت و داركاری دەكردین.

دڵەكوتەی شەممەم لە دڵدا بوو. ئـەو هـەموو راهێنـان و جـەدوەل زەرب و مامۆسـتا نـا میهرەبان و دەنگی ماستفرۆشی گەرِۆكی كۆڵان. بۆچی هیچ كەسێك نەبوو ئێمەی خۆش بوێ ؟ بەلاَم بۆمان پەیدا بوو ، ئەویش ئەو بێچوە پشیلانە بوون كە شەوان بە دزیەوە دەمان بردنـە ناو نوێنەكانمانەوە. دەستەكانمانیان دەلێسیەوە یاریان بۆ دەكردین. بـەلاَم كـە خافـڵ دەبـووین گازیان لە پێی باوكم دەگرت و دەیان لێستەوە باوكیشم تووڕی دەدانە ئەو سەری حەوشە.

شیعری (منداڵی هەتیووم) لەبەر خۆم دەخوێندەوە ، كە گۆزەی لێشكا بوو. كەوتمە بـیری چۆلەكەكەم كە چەند رۆژ پێش ئێستا مردار ببۆوە. رەنگە گرەوی كردبـێ كـە لـە قوتابخانـە بگەرِێمەوە ئەوسا مردار بێتەوە. كە گەرِامەوە كزبـوو. مووچـەم بـۆ كـردو لێـی نزیكیـەوە، سەری بە زەوی كردو و مردار بۆوە.

خۆر ئاوادەبوو. كە دەچوومە ناو (ئاشورا)وە ، دەمبینی هـەتاو هێشـتا لەسـەر دیـواری نانەوا خانەكە ئاوا نەبووە.

حەوسەڵەی چوونە دەرەوەم نەبوو. چوار پا منی بە خۆیـەوە چەسـپاند بـوو بـاوكم پرخـە پرخی دەهات. برسی بووم. بەلاَم دایكم من و (ئەكبەر)ی سوێند دا بوو كـە دەسـت بـۆ نـان نەبەین.

بە پارِانەوە پێی ووتین: ـــ

ـــ بەپیر بە پێغەمبەر، پارەم نییە جارێکی تر نان بکڕم.

لەپاشدان وتی: ـــ دەبڵێین بە ئیمام رەزا نان ناخۆین!

ئێمەش لە رۆخ (ناندین) ڕاوەستا بووین پێکەوە وتمان: ـــ

ـــ بە ئیمام رەزا بە گیانی دایە دەست بۆ نان نابەین.

دایکم چوو بووە بازاری کولیچە فرۆشان تاکو ئەم کلاّشانەی کە چنی بوونی بیانداتەوە خاوەن کارەکەی و لەسەر ڕێگای خۆی سەر و پێمان بۆ بکڕێ ئەگەر دوکانی خاوەن کاری دایکم داخراو بوایە زۆر خەمگین دەبوو. تا دەگەیشتەوە ماڵ هەر دەگریا.

رۆژنامەیەك لەسەر رووی دەرگا دەجوولاّوە. وێنەی سێ منداڵ لەسەر رۆژنامەکە بوو ورچێکی گەورەیان لە باوەش گرتبوو. ورچەکە زۆر قەڵە و جوان بوو.

دووبارە کەوتمە یادی شیعری (منداڵی هەتیو) لە وێنەکەدا ورچەکە زۆر قەڵەو و جوان بوو.

دووبارە کەتمە یادی شیعری (منداڵی هەتیو)کە وێنەکەی لە ناو کتێبەکەماندا بوو و دڵم تەنگ بوو. شتێك لە ناو قوڕگمدا سەری دەکرد و دەگەڕایەوە. لەقوڕگم هاتە سەرەوە. هاتە نێو رووم.. ناو چاوەکانم و لە چاوەکانم هاتە دەرەوە و رووی گەرم داهێنام. بەپشتی دەستم فرمێسکەکانم سڕیەوە ، سوێری فرمێسك چووە ناو شەقارەکانی دەستم و زوراوە.

تیلەی دەرگا دەکرایەوە. ئەکبەر سەری لە ژوور خوار کردەوەو پاشدان بە سەری پەنجەکانی پێی هاتە ژوورەوە و سەری لە بن گوێم نا بە پسکە پسکێکەوە وتی:

ـــ دوو ماسی بچکۆڵە هاتوونەتە رۆخ ئاوی ئاشورا. دێی بچین بیانگرین؟!

بە پەرۆشیەوە وتم: ـــ بابچین ، بابچین ، لەسەرەوەخۆ.. با ، بابە بە ئاگا نەیێ.

کە تەکانم خوارد چوار پاکە جیڕە جیڕێکی کرد پرخە پرخی باوکم بڕا.

ئەکبەر لە ترسان زەندەقی. چوو خۆی مات کرد. باوکم گەوزی داو لاکەلەکەی خۆی گۆڕی وتی: ـــ

ـــ خوایه غـەزەبمان لیٚ نـەگری لـە جێـی خۆمـان دانیشـتینەوە لەسـەر چـوار پایـەدا هەڵتوترکاین. لەسەر چوار پایـەدا کلافیـك دەزوی کـلاش و سـوژنێکی لێکـەوتبوو. بـاوکم کەوتەوە پرخە پرخ.

بەسەری پەنجەی پـێم ڕۆیشـتم و نوقڵدانـە بچـووکەکەی قـوژبنی دەلاقـەم. نوقڵدانەکـە ملەکەی شکابوو لە ناو ئاشورا دادۆزیبوومەوە لەگەڵ ئەکبـەر ڕۆیشـتین. کـە گەیشـتنە ڕۆخ ئاوەکە ئاسەواری ماسی دیار نەبوو. دڵم داخورپا بە ئەکبەرم وت:

ـــ ئەدی ماسیەکان لە کوێن هەی بەد فەڕ دیسان درۆت کرد.

ئەکبەر وتی:

ـــ خۆت بەدفەڕی لێت مەعلوم بیٚ ڕۆیشتونەتەوە ژێر قوڕ و لیتـەکان. دەسـتم بـۆ ژێـر قوڕاوەکە برد و دەستم گیٚرا. ماسییەکی بن سك زەرد خۆی ڕاپسکاند و ئەکبەر بـە شـادیەوە وتی: ـــ ئەی ئیمامی زەمان ئەوەتان.

نوقڵدانمان پڕ لە ئاو کرد. هەر دووکمـان بەیەکـەوە بـە هەوڵـدانێکی زۆر ماسـییەکانمان گـرت. هـەتاو گەیشـتبووە سـەر ڕۆخـی دیـواری نانەواخانەکـە سـارد و سـەرمای ئێـوارە دەستەکانی سڕ کردبووین لەسەرەخۆ هاتینە ژوورەوە. دایکـم نـەهاتبۆوەو. ژووررەوە کـەمێك تاریك داهاتبوو باوکم هێشتا هەر پرخە پرخی بوو.

مندالّەکانی سەر ڕۆژنامەکە ونببوون. لەسەرەخۆ چوینە ژێر چوار پاکە. بەسـکی برسـی نووستین و نوقڵدانمان لە پـێش خۆمـان دانـا. ماسـیەکان بـە چـاوە زیتـەکانیان تەماشـایان دەکردین. ئەکبەر دەستی درێژ کرد و نوقڵدانەکەی بۆ بەردەمی خۆی ڕاکێشـا. مـن دووبـارە هێنامەوە بەردەمی خۆم.

ئەکبەر بە دەنگی بەرز وتی:

ـــ هی خۆمە ها!

بەرەنجانەوە وتم:

ـــ نوقڵدانەکەیشی هی منە ـــ تازە من بۆم هێنای.

بە توندی وتی: ـــ هی خۆمە. هی خۆمە. من یەکەم جار دۆزیمەوە.

لەسەرەخۆ وتم:

ـــ ئەی نوقلدانەکەی من چییە ؟

وتی: ـــ ئێستا دەچم جامێك دەهێنم.

لەگەڵ ویستی هەڵسێ و پێی بە مەنجەڵی ژێر چارپاکە کەوت. پرخە پرخی باوکم بڕا. لــە داخان پەلی نەرم و بێ خوێنی ئەکبەرم گرت و بامدا و لە تاوان لەرزیم.

ئەکبەر قیژیەکی خەفە کراوی کێشا: (ئای ، ئای).

ماسیەکان بێ جووڵە وەستا بوون و ئاویان دەخواردەوە. چــوارپا جــووڵاوە. بــاوکم بەســەر سەرمانەوە وەستا بوو. چاوەکانی وەك چاوی ماسییەکانی لێ هاتبوو. لە ترســان چــوینە ژێــر چوارپاکەوە و لە ژێرەوە لێفەکانمان بە توندی گرت.

لەسەر لێفەکەوە دوو مستە کۆڵە بەسەر سەرماندا هاتە خــوارێ لێفەکــەمان تــوڕداو بــە زیرەو هاوارەوە ڕامان کردە دەرێ. نوقلدانەکە لەناو دەستی باوکمدا بــوو. دەرگــای کــردەوە و فڕێیدا حەوشە.

ماسییەکان لەسەر زەوی کەوتنە فرتە فرت. قەلەڕەشێك لە ڕۆخ دیــواردا باڵــە فڕەیــەکی کرد هات و ماسییەکانی برد.

لە دوورەوە هەورەکانی ئاسمان رەش هەڵدەگــەڕان. لــەناو تــاریکی قادرمــەکانی ســەربان هەڵتروشکابووین. فسەکە فسکی رقاویمان دڵی تاریکی شەوی دەسووتاند.

ـــ گوناهی تۆ بوو.

ـــ گوناهی تۆ بوو.

ـــ ناوەڵاً گوناهی تۆ بوو.

ـــ ناوەڵاً گوناهی تۆ بوو.

دڵم دەگوشرا. لەئاشوراوە نــوزەی توتکــە ســەگێکی کوتــەك خــوارد و دەهــات. دایکــم نەهاتبووەوە ، رەنگە دوکانی خاوەن کارەکەی نەبووبێ و ئــەویش هێشــتا بــە چــاوەڕوانی لــە پشت دەرگای دوکانەکەدا دانیشتبێ.

# کــا

قوتابخانەکە حەوشەیەکی گەورەی هەبوو. لـە دوو ژووری قوتابخانەکـە یـەکێکیانم کردبووە پـۆلی دەرس خوێنـدن و ئـەوی تـریش خـۆم تێیـدا دادەنیشـتم. کـادینێکی گەورەلەلای ڕاستی حەوشەوە بوو متبەقێکی جێهێڵراوی لە تەنیشتەوە بوو. کادینە پڕ لە کایەکە هی داودخانی خاوەن خانووەکەی قوتابخانە بوو.

شەوان تەنیا بووم. غولام ڕەزای فەڕاشی قوتابخانە تـا درەنـگ لـەلام دەمایـەوە. ژنیك و منداڵێکی سێ ساڵانی هەبوو. ڕۆژی بە سێ تومان بە موەقەتی بـە فەڕاشـی قوتابخانە دامەزرابوو، بـەو ئومێـدەی ڕۆژێـك دابـێ بەیـەکجاری دابمـەزرێ، ڕۆژانـە حەوشەو هەیوان و پۆلی گەسك دەدا. لـە بیرەوەکـە ئـاوی دەردەهێنـا لـە سـارداوی دەکرد. کە کاری تەواو دەبوو، دەکەوتە ناو کۆڵانـەکانی دێ و بـە ماڵانـدا دەگـەڕا و هێلکەی دەکڕی و بە دوکاندارانی دەفرۆشتەوە.بەلەباریکەیەکی.. ئێسکی دەم و چـاو دەپەڕیوو بوو لووتی جوان بوو هەموو دەم خەمبارو مـەلوول بوو.هەمیشـە ترسـێکی نادیاری لە ڕوودا دەبینرا.

زستان بەبای بە هێزی ساردی گوێزانیەوە هات. دووبارە ملەی ((قەلاجـە)) بـەفر داپیۆشی و ڕێگاکان گیران. ترس لە هەموو کەسێك نیشت هەر کەسی مشتێك گـەنم یا ئاردی هەبوو ، بە ترس و لـەرز ، وەك گەنجینەیـەکی بـە نـرخ ، ئاگـاداری دەبـوو دەستی پێوە دەگرت و بە پارێزێکی تەواوەوە لەکاری دەهێنا.

کە لە قوتابخانە دەهاتمە دەرەوە هەر دوو لای جادە بەلاشەی مرداری گا و مـەڕ و بزن تەنرا بوو خەڵکی لە حاڵێکدا بوون فرمێسکیان هەڵدەڕشت.

پێستی ئاژەڵە مردارەکانیان کەوڵ دەکرد و لە رۆخ دوکان و پشت دیواری ماڵاندا هەڵیان دەخستن. شیوەنی ژنان ، وەك بڵێی عەزیزیان مرد بێ. لە ماڵەکانەوە دەهاتە گوێ. تا چاو بڕی دەکرد، پێستی بۆری دامەن سپی و قاوەیی و رەش لەرۆخ یەکدا هەڵخرابوون چاوم دادەخستە بەر خۆم تا بەژن و باڵاّ و پەیکەری ماتەم داران نەبینم.

شەوێك. غولام رەزا بەسەر گەشتەیی و نا ئومیدی و خەمناکیەوە پەیدا بوو. یەکبەدوای یەکدا جگەرەی دادەگیرساند. ئەنگوستە لاوازەکانی کە لە دوکەڵی جگەرەدا زەرد هەڵگەڕابوون دەلەرزی ، لێم پرسی: ـــ ((هەموو ساڵ حاڵتان بەم شێوەیە ؟ ))

سەری باداو لەگەڵ بە باکردنی دوکەڵی جگەرەکەیەوە گوتی ((بەڵێ هەموو ساڵ هەمان تاس و حەمامە. ))

گوتم: ((ڕادیۆ گوتوویەتی دەوڵەت ئازوقە و ئالیك بۆ ئەو دێهاتانە دەنێرێ کە سەرما زیانی پێگەیاندوون. ))

وتی: ((ئێستاکە وا باشترە چەقۆمان بۆ بنێرێ تا پێستی ماڵاتە مردارەکان کەوڵ بکەین.)) پێکەنینێکی تاڵی گرت و بەم لاو ئەو لایدا ڕوانی. وەك ئەمەی کە بیەوێ شتێك بڵێ و شەرمی دەکرد. وتم: ((هەر دەتەوێ شتێ بڵێی چی ڕوویداوە؟ ))

بەشەرمەوە وتی: ((نا ، نا ، بەلاّم... شەرم دەکەم. ))

وتم: ((شەرمی بۆچییە ئێمە برادەری یەکین. هەر کارێکم لە دەست بێت بۆتی دەکەم.))

گوتی: ـــ ((بەخوا ، تازە مانگاکەم زاوە و خەریکە لە برسان دەمرێ. گوانەکانی وشك بوون. ویستم ئەگەر ماوەم بدەی لەم کادینە شەوی یەك گونیە کا بۆ مانگاکەم ببەم تا دەرگام لێدەکرێتەوە.. ژن و منداڵەکەم تا ماون دوعاتان بۆ دەکەن.))

سەری لەبە خۆ نا ، منیش کەوتمە بیر کردنەوە کایەکە هی داود خان بوو و لە ماڵەشدا تەنیا من دادەنیشتم. رەنگە شەڕێکم بێ بە تووشەوە.

بەلاّم نەشم دەتوانی خۆم لەبەر رووە ئێسقاوی و رەنگ تێدا نەماوە شەرماویەکەی غولام رەزا دابگرم و گوتم: (( هەر چیت دەویٚ بیبــەو مانگــا و گوێرەکەکـەت رزگـار بکە. ))

بە خۆش حالّیەوە لە جێی خۆیدا رەپیٚ بوو گوتی: ((خوا سێبەری ئێوەمان لەسەر هەلّنەگریٚ تاماوین لە چاکەتان دەرناچین.))

بەیانی زوو بوو. لە حەوشەی قوتابخانە پیاسەم دەکرد. هێشتا خۆر هەلّنــەهاتبوو. سەیری سەر رۆخی دیوارم دەکرد چۆلّەکەی لە سەر هەلّنیشـتبوو لــە پـڕ چـۆلّەکەکان هەلّفڕین و جامێکی مس لە ســەر دیــوارەوە بەدەرکــەوت. دەسـتە رەق و تەقــەکانی رۆخی دیواریان گرت و دەموچاوی غولاّم رەزا لــە نێــوان هــەردوو دەسـتدا بــە دیـار کەوت.

هەمیشە لەســەر دیــوارەوە دەهاتــە ژوور تــا تەقــەی دەرگــای قوتابخانــە بێـدارم نەکاتەوە. بەردێکی زلم لە پشت دەرگای قوتابخانــە دادەنـا تـا شــەوان کـەس نەیەتـە ژووریٚ.

لە سەر دیوارەکە دانیشت و پاشدان بازی دایە ناو حەوشە و جامەمسەکەی لەسەر دیوارەکەوە هێنا خواریٚ. بەهەمان شێوەی شــەرمنییەوە ســەلامی کـردو جامەکــەی لەلایەکی هەیوانەکە دانا. گوتم: ((چی هەیە چی نیە ؟ئەم جامەت بۆچی هێناوە!؟))

ملە باریکەکەی کەچ کردو گوتی ((مامۆستا شیرم بۆ هێناوی مانگاکەم کە کـای خوارد، گوانەکەی پڕلە شیربوو.))

بە ناڕەحەتیەوە وتم: ((جامەکە هەلّگرەو بڕۆ پێویستیم بــە شــیر نییــە ، مەگـەر نەخۆشم تا شیر بخۆمەوە.))

ئیش گەیشتە ئەوە دەستی بە پاڕانەوە کرد بە شــێوەیەك لــە قســەکەم پەشــیمان بوومەوە جامەکەم بردە ژوورەوە غوللام رەزا خۆی خەریکی مالّینی هەیوانەکە کرد.

هەموو شــەوێك غــولام رەزا گونیەیــەکی گــەورەی کـا دەبردەوەمــالّی و هــەموو بەیانیەکیش پێش خۆر هەلاّتن جامەکەی لەسەر دیوارە قوڕینەکەی قوتابخانە بە دیـار

دەکەوت. ڕۆژێکیان سەرێکم لە کادین خوار کردەوە ، کادینێکی گەلیٚ گەورە بوو. تا بنمیچ پڕی لە کا بوو هەوو ڕۆژێك ئاژەلْ مردار دەبوونەوەو پێستە بۆرەکانیان لەم بەر و ئەو بەری جادە ڕادەخران. هەمیشە غولام ڕەزا دەیگوت: ((ئیشاللا ڕۆژێك وەرە مانگاکەم ببینە گوێرەکەکەم ببینە. نازانی ئێستا چەندە قەلەو بوو ون ! ؟))

وەلامم دەدایەوە: ((باشە غولام ڕەزا ، باشە ، ڕۆژێك هەردێم )).

هەینی بوو لە ژوورەکەم دانیشتبووم و سەیری نووسینەوەی قوتابیانم دەکرد و ڕاستم دەکردنەوە یەکێك لە قوتابییەکانم کەوا هاوسێی غولام ڕەزا بوو ، خۆی کوتایە ژوورەکەمەوە هەناسە بڕکیٚ بوو گوتی (( مــ.. مامۆستا ، حالْی ژنی غولام ڕەزا خراپ تێکچووە منی نارد تا پێتان بلێم.

بە خێرایی چوومە مالْیان. غولاٚم ڕەزا لە قوژبنێکدا دانیشتبوو. دەستی لە ئەژنۆی وەر هێنا بوو ژنەکەی لەناو نوینێکی چلکن و دڕاودا نوستبوو لرخە لرخی لێوە دەهات چەند شووشە دەرمان و نەختێك فستقی بە دەورو بەردا ڕژابوو.کوڕە بچووکەکەی بە ورگی دەرپەڕیو ڕەنگی زەردەوە لە باوەشی پیرە ژنێکدا بوو من نەم دەناسی. دانیشتم و گوتم چی بووە غولاٚم ڕەزا ؟ دیسان دەردو بەلاٚیە))

سەری بە ئەژنۆی کردو بە خەفەتەوە گوتی: ((نابینی. بەخوا دوو ڕۆژە بێهۆش کەوتووە، قسە ناکاو ئیمڕۆ حالْی زۆر شرە نازانم چیبکەم.))

گوێچکەکانی سوور بووەوەو گوتی: ((مامۆستا..نابیٚ،ئاخر..)).

پێموت بەخێرایی: ((بۆ شاری ببە))

گوتم:((پارەت بۆ ئامادە دەکەم، خەم مەخۆ، منداڵەکەشت ببەلای پزیشك، لە لایەنی قوتابخانەشەوە خەیالْت ڕەحەت بیٚ خۆم لەگەلْ منداڵەکاندا ڕێکی دەخەم.))

گەش بووووەوە.. تارمایی زەردە خەنە پژایە سەر لێوەکانی و کەمیٚ گەشاوە وتم: ((حالْی مانگاکەت لە چی دایە ؟ گوێرەکەکەت چۆنە؟ خۆ ئەوانیش نەخۆش نەکەوتون؟))

بەم قسە قەلەمی ئەژنۆی شکا. بە ترس لەرز و زمان گێڕانێکەوە

گوتی: (( باشن مامۆستا زۆر باشن. لەگەڵ گا و گۆتاڵی دراوسێ کانماندا ناردووە من بۆ دەرەوە کەمێك بخولێنەوە.))

کە خەریك بووم غولام رەزام بەجێ دەهێشت منداڵەکە خۆی گەیاندە من و گوتی: (( مامۆستا غولام رەزا زۆر بەدبەختە، ئەسڵەن هەر مانگای نییە ، وا دیارە درۆی لەگەڵ تۆدا کردوە.))

ڕاچەنیم ، بەڵاّم بەسەر خۆم نەهێناو خێرا خۆم و هێنایەوە سەر خوێن ساردی خۆم و بە توندی گوتم: ((خۆم دەمزانی )).هاتمەوە قوتابخانە.

بەیانی زوو غولام رەزا دووبارە بە خۆی و جامە شیرەوە پەیدا بوو سەیری چاوەکانی نە کردم پێم گوت: ((پێویستم بە شیر نییە، شیر نا خۆمەوە چیتر مەرایی مەکە

گوتی: ((ئاخر چی بووە ؟ مامۆستا زمان کورتم مەکە. تو ناوی خوا پێم بڵێ چی بووە ؟ قسەیەکت بیستوە ؟ ))

بە تانە و پلارەوە گوتم ((مانگاکەت لە چۆڵی گەڕاوە ؟))

گوێرەکەکەت چۆنە! ؟..)) لەناکاو بە خۆیدا شکایەوە. لە قوژبنێکی هەیوان دانیشت بە خەفەتەوە گوتی: (( مامۆ... مامۆستا. من شەرم لە چاوەکانت دەکەم. دەبووایە راستیەکەیم پێ بووتایەی لە راستی من مانگام نەبوو ، کایەکەیم دەفرۆشت و داو و دەرمان و خواردنم بۆ ژنە نەخۆشەکەم پێدەکڕی ، بۆ ئێوەش لە مالاّن شیرم دەکڕی.)

لە پڕمەی گریانی داو لە حەژمەتان شانەکانی تەکانیان دەدام جامە مسیەکەی لە پشت کورتەکە رەشەکەی ون دەبوو.

بە فێڵی پیاسە کردن گەڕامەوە دواوە لە و دوورکەوتمەوە تا فرمێسکەکانی نەبینێ.

# سێ خەزنە[1]

پێك کەوتنی دەرگا دارینە رزیوەکە ئەو قەلەرەشانەی هەڵفڕاند کە لەسەر دیـوارە قوڕینەکەدا هەڵنیشتبوون. قڕە قڕیان ماڵەکەی پڕ کرد و لەســەر بــەفری قولینچـکی حەوشەکەدا نیشتنەوە، لەبەر پێی ئەو پیرە مێردە لاکەوتن کە بە مات و پەریشانی لە ژووری دەهاتە دەرێ.

پیرە مێردەکە کلاوە خوریەکەی تاسەر برۆکانی هێنا خوارێ.

فوی لە دەستەکانی کرد. دەرگاکەی مەحکەم داخسـت. دەسـتەکانی خسـتە نـاو باخەڵی. ناو کۆڵاَن قــەلاَتێك بــەفری لێ کــەتبوو ، گـیرا بــوو ، بەتەنگـەتاوی بــەبن دیوارەکەدا دەستی بەڕاکردن کرد. لەسەر شەختەدا هەڵخزی و خۆی بە دیوار گرتەوە. گلۆتە گلێك لە دیوارەکە بۆە و بەسەر شانیدا بەر بۆوە خوارێ، خانووەکان تا سواندان نوقمی بەفری ناو کۆڵاَن ببوون. تاك و تووك منداڵاَن بە شێوەیەك کەوا فرمێسـك لـە چاویاندا قەتیس مابوو دەرۆیشتن پیرە مێردەکـە بـە بـەر دەرگـای رەژوو فرۆشـەکەدا تێپەڕی ، لەبەر خۆیەوە وتی: (( ئاخ خ گەردوێنی شەو پارەم دەبوو )). ئەو پەیتونەی بە شەقامەکەدا تێپەڕی ، خەریك بوو خـۆی لێـدا ، پەیتونچـی پـیر لەوبەرزاییـە دا هەڵتروکابوو جوێنی بە ئەسپەکان دەدا. شەختە لـە ژێـر سمـی ئەسـپەکاندا دەشـکا. ئەسپەکان بەرەو پێشـەوە دەرۆیشـتن. هـەڵم وەك سـتوونی رێـك لـە کـونی لوتیانـدا دەردەچوو. گەیشتبووە ئەو پەڕی شار. شەقام قەڵە باڵختر بوو چەند منداڵێك لە نێوان پیادەکانەدا لەسەر ئەو شەختانەی هـەڵیان خزانـد بـوون هەڵدەخلیسـکان. کـە پـیرە مێردەکە بە تەنیشتیاندا تێدەپەڕی یەکێك لە منداڵەکان بـەر بـۆوە. پـیرە مێردەکـە

---

[1] - سێ خەزنە: لە دەقەکەدا (سێ کوپەڵە خوسرەویە ) کە ئەمیش گەنج و زێـڕی پاشـا کۆنەکانـە. بەلاَم لە لای خۆمان هەر (خەزنە) یان (خەزێنەی) پێ دەڵێن.

داهاتەوەو بن هەنگڵی منداڵەکەی گرت و گەرمایی ژێر کەوشی منداڵەکە پژایە ناو پەنجەکانیەوە. سەیرێکی پێڵاوە بریقەدارو کڵاوە سوورو جوانەکەی کرد. منداڵەکە بە چاوە جوانەکانی سەیرێکی پیرە مێردەکەی کردوو وتی: ((سوپاس گەورەم )).

پیرە مێردەکە رووی وەرگێڕاو کەوتە ڕێ. فرمێسك لە چاوەکانیدا قەتیس مابوو. هەنگاوەکانی گورج کرد ، کە گەیشتە ئەو سەری شار یەکسەر و یەك ڕێ بەرەو لای باغێکی گەورە رۆیشت ، لەبەر دەمی باغەکەدا پاسەوانێك وەستا بوو. پێیەکانی بەستبووی لێوەکانی بەزەحمەت لەسەر یەك دادەنا دڵی دەگوشرا. لە ڕقان قوڕگی هەڵاوسابوو. دەیویست سەری بە پەرژینە ئاسنەکەی دەوری باغەکەدا بکێشێ. لەبەر خۆیەوە منە منێکی کرد: (( سەختە ، زۆر سەختە ، بەڵام دان بە خۆمدا دەگرم ، سەبری بچووکی خوا چل ساڵە ، دەبێ بە جارێك بیان هەژێنم. دڵیان لەگەڵیدا ڕاوەستێ. بێ ئابڕوینە )). ویستی بۆ ناو باخەکە بچێ ، بەڵام پاسەوانەکە نەیهێشت. پیرەمێردەکە شتێکی بەبن گوێیدا چرپاند و قسەیەکی کرد ئیشارەتێکی بۆ ساختمانەکەی ناوەڕاستی باغەکە کرد. پاسەوانەکە کابرای بۆ لای ئەو پاسەوانە پیرەی دیکە ڕەوان کرد. کە لە بەر دەرگای خانووەکەدا وەستا بوو ، بگرەو بەردە لەگەڵ ئەودا دەستی پێکرد ، پاسەوانە پیرە چاوێکی بەم لاو ئەو لادا خشاند و دەستی پیرە مێردەی گرت و چوونە ناو ساڵۆنێکەوە. نەختێ گەرمی بۆوە. پاسەوانەکە ئیشارەتێکی بۆ کرد تا لە لایەکدا بوەستێ و خۆیشی چووە ژوورێکەوە ، پاش کەمێك هاتەوە دەرێ پیرە مێردەی لەگەڵ خۆیدا بردە ژووری، لە پشت مێزێکی لە دارگوێز دروست کرا و کە پارچە شووشەیەکیان لەسەر دانا بوو ، یەکێك بە بەرگێکی ڕێك و دەموچاوێکی گۆشتن و بۆ ینباخێکی پان و سپی یەوە دانیشتوو.

پاسەوان قاچەکانی بە توندی پێکدا کێشاو ئامادە ڕاوەستا.

پیاوە بۆ ینباخ سپیەکە سەری کاغەزەکەی بەردەمی بڵند کرد. رووی لە پیرەمێردە کردو پرسی: ((ها چیت دەوێ ، کەسێك نە بوو لەباتی تۆ بە ئیش و کارەکانت هەڵسێ ؟! ))

پیرەمێرد بە دەستە پاچەیی وەڵامــی داوە: ((نـا قوربـان ، ئیشـێکم بـە جـەنانی بەریزتان هەبوو ، جگە لە جەنابتان لە کەسی تر دڵنیانیم. ))

ــــ چۆن!! چیت دەوێ ؟!

پیرەمێردە بە دزییەوە سەیرێکی ئەم لاو ئەو لای کرد. لە مێزەکە نزیـك بـووەوە. چاکەتەکەی لە ئالاّ بچووکەکەی سەر مێزەکە گیربوو. ئالاّکـە کـەوت ، پاسـەوانەکە بەخێرایی ئالاّکەی هەڵگرتەوە ، لە شوێنی خۆی دایناوە. پیاوە بۆین باخ سپیەکە لـە حالەتێکدا خۆی بۆ دواوە دەکشاندەوە ، وتی: ((قسە بکە ، ئـیتر ، بۆچـی ئەمەنـدە نزیك دەبیەوە ؟ ))

ــــ قوربان... لەناو... ماڵەکەمدا ، سـێ خەزنـە بـە دیـار کـەوتووە ، بـەڵێ ، بەڵێ... قوربان بە حەزرەتی عەباس ، بەم وێنەی بەسـەر سـەرتا نەوەیـە درۆ ناکـەم قوربان. پێکەنی ، پێکەنینەکەی پێکەنینێکی تاڵ و بە زۆر لە خۆکردنەوە بوو.

ــــ درۆ نەکەی پیرەمێرد. ماڵت لە کوێیە ؟

ــــ لەسەری تەپەیە. قوربان جەنابی بەرێزتان تەشـریف بێـنن. ئـەو کاتـە چـاوە موبارەکەکانتان کوپەڵەکان دەبینن.

بۆ ینباخ سپیەکە تەلەفۆنی بۆ چەند کەسێك کرد. لە خۆشیا سوور هەڵگەرا بوو و هەڵسا ، پاڵتۆکەی لەبەر کرد و خۆی رێکخست پیرەمێرد ئەمانەی دەدیت و فوی لـە دەستەکانی دەکرد.

کەوتنە رێگا چەند کەسێکی تریشیان لەگەڵ هـات. سـواری ئۆتـۆمبیلێکی شـین بوون کە لە رۆخ شەقامەکەدا وەستا بوو ، رۆیشتن. ئۆتۆمبیلەکە لە رۆخ یـەکێك لـە شەقامەکانی خوارووی شاردا ڕاوەستا. خەڵك بەسەر سـامیەوە سـەیری ئۆتۆمبیـل و زەلامەکانی ناوەوەیان دەکرد. تـا ئـەو وەختـە ، نـە ئۆتۆمبیـل ، نـە زەلامـی لـەم بابەتەیان لەو شوێنە نە دیتبوو.

شوفێرەکە دابەزی. پیاوە بۆ ینبـاخ سـپیەکە کـلاّوە خڕەکـەی بـان سـەری هێنـا خوارەوە. ئەوانی دیکە ملیان لەناو یاخەی پاڵتۆکانیانەوە بردبووە خـوارێ ، کەوتنـە

رێگا ـــ تەنیا پیرەمێرد بوو وەك مەرێك لە كۆتایی پایزدا خوریەكەیان بڕیبێتەوە لە سەرمانا هەڵدە لـەرزی. هـەڵمی ئـاو لەسـەر سمێڵـی زەنگوڵـەی بەسـتبوو. تـرس و خەمێكی قووڵ لە روویدا تێكەڵ یەكتر ببوون ، بەلاّم ئەوەی لە قولاّیی كەلێنی چورچ و لۆچەكانی دەم و چاویدا نیشتبو ، رق و كینە بوو.

گەیشتنە ئەو كۆلاّنەی كە ماڵی ئیختیارەكەی لێ بوو ، كەڵەشێرێكی پیر بێهـودە دەنووكی بەزەویدا دەكوتا. پیرەمێرد دەرگای كردەوە. لاونیـو وەسـتا و كشـاوە دواوە تائەوان بچنە ژوورەوە.

لەناو حەوشەدا گردێك بەفر كەوتبوو. دیوارەكان تا ناو قەدیان خوسا بوونەوە. لـە رۆخ دیواردا شوێن پێی قەلەرەشەكان ئاسـەواری مـابوو.ماڵەكـە لـە دوو ژوور پێـك هاتبوو بنمیچی یەكێكیان هاتبوو خـوارەوە. ژوورەكـەی دیكـە دەرگـا و پەنجـەرەكی هەبوو. پەنجەرەكە بە مەحكەمی وەك مردوێك دەمـی پێـك دادابـوو لەسـەر رۆخـی خوارەوەی شیشەكان ، ئاسەواری ئاوەڕۆی بارانەكانی پێشوو مابوو. وەك منداڵاّن كـە شوێنی رێچكەی فرمێسك لەسەر رووی كۆلمەكانیاندا دەمێنێتەوە.

پیرەمێرد بە پرتاوی خۆی رەپێش كرد. چوونە ژوورەوە. بۆ ینباخ سپیەكە فرمانی بە یەكێك لە دەستەكەیدا تا بۆ نووسـینی سـورەتی دانیشـتنەكە ئامـادە بـێ. ئـەو پیاوەی جانتایەكی ڕەشی لە بن كەوشدا بوو ، ئامـادە ڕاوەسـتە و وتـی: (( سەرچـاو قوربان دەستور بفەرموون. ))

جانتاكەی كردەوە. لە ناوەڕاستی ژوورەكەدا چوارپایەك دانرابوو كۆنـە لێفەیـەكی چڵكنی بەسەر دا درا بوو ماتەم دار ئارامی گرتبوو. ئـەرز سـارد سـارد بـوو. چـەند گونیەیەكیان لـە نـاو چـوار پایەكـە دانـا بـوو. لـەناو دەلاقەكـەی ژووریٚ چـرایەكی ئینگلیسی دوو كەلاّوی رەش دانرابوو، شووشـەیەكی لـە قـوڕ دروسـت كـرا و چـەند (كەلا)[1] یەك دەبینرا.

پیاوە بۆ ینباخ سپییەكە لە ئیختیارەكەی پرسی:

---

١- كەلا: هەڵمات.

((باشە ، لە کوێیە ؟! بۆ خەریکم دەکەی ؟! ))

پیرەمێرد لەناکاو بۆ لای چوار پایەکە ڕایکرد. لێفەکـەی هەڵدایـەوەو بـە ڕقـەوە هاواریکرد. (( ئەمەتان قوربان هە هە هە ئەمانە سێ کوپەڵە خەزنـەی خوسـرەوین. چاك بیان بینە چەند شینن، بەڵێ قوربان. هە هـە ، قوربـان.)) بۆینبـاخ سـپیەکە و ئەوانی تر سەریان لێ نزیك کردەوە. چاویان لەگەڵ تاریکیەکەدا کەمێك ڕاهاتبوو ، لە ناکاو پیاوە بۆ ینباخ سپییەکە ڕاچەنی چاوەکانی زەق بوونەوە.

قژو کەزی زێرینی کچۆڵەیەك لەسەر زەوی و لەگەڵ خۆڵی ناو کورسـیەکە تێکـەڵ ببوو[1]. لە ژێر چار پایەك دوو کوڕ و کچێك ، دەستیان لە ملـی یـەك کـرد بـوو ڕەق ببوونەوە.

دەموچاوە شین هەڵگەڕاوە بچووکەکانیان لە بن میچ بڕی بـوو ڕەنگـە چـاوەڕوانی شتێك بووبن.

های و هووە ڕقاویەکەی پیرەمێرد لە حەوشەوە دەبیسترا شێتانە هاواری دەکرد:

((مەگەر هەر بۆ زێڕ و گەنج بێنە ماڵەکانمان. بۆ کوپەڵە خەزنە )).

---

٢- کورسی هەر وەك چوار پای خۆمانە بەلاَم ئەوان بۆ گەرم داهێنانی مەقەڵە ئاگری لە ژێر دادەنێن و لە ژێریشی دەنوون.

# کورتە چیرۆکی سێ خەزنە

ئەم کورتە چیرۆکە کە باسی پیرەمێردێکی بێدەرتانی بە سالاچوو دەکات کە لە کەلاوەی خانوویێکدا دەژی کە تەنیا ژوورێکی دانە تەپیوە ، هیچ شتێکی دیکە لە مەڕ ئەو پیرەمێردە ئاماژەی بۆ نەکراوە ، بەلاّم لە کوتاییی چیرۆکەکە وا دەردەخا کە ئەم پیاوە بەستە زمان بیکەس و نەدارە ئەرکی بە خێوکردنی سێ مندالّی چاو شینی جوانی لە ئەستۆ دابووە و ئەیش جگە لەوەی لە ژێر لێفەوایان پۆشی هیچی دیکەی لە دەست نەهاتووە، واتە نەیبووە خواردنێکیان بداتێ هەر هیچ نەبێ لە مردن رزگاریان بکا — مندالّەکان هی کێ بوون، هی کوڕی، هی کچی، خزمێکی ئەمەیان دیار نەکراوە.

بۆیە کە دەزانی مندالّەکان مردون، بە مەبەستی گالّتە کردن بە دام و دەزگا و دەولّەت روولە بنکەییێکی پۆلیس دەکا بۆ ئەوەی پێیان رابگەیەنێ کە لە مالّەکەی سێ خەزنە وەردەرکەوتوون، پیاوانی دامودەزگاش کە دەچن بۆ ئەوەی بزانن ئەم خەزێنانە چین و: سێ مندالّی چاو شینی جوان لە ژێر لیفەکەدا دەبینن کە هەر سێکیشیان مردوون.

وادیارە علی ئەشرەف دەیەوێ ئەمە وەك هێمایەك بخاتە روو کە ئەگەر خەزنە لە مالّەکەتدابێ ئەوا دەبێ بۆ دەولّەت بێ و بەو بۆنەیەوەش روو لە مالّەکەت دەکەن،

ئەگینا ئەگەر لە برسان بشمری کەس نیە لاییێکت لێبکاتەوە یـان روو لـە ماڵەکـەت بکا.

بە گشـتی هەسـتی مرۆڤدۆسـتی پیرەمێردەکـە لـە چـەند خاڵێـك نیشـان دەدا. بەتایبەتی ئەو کاتەی کە دەچێ بۆ پۆلیسخانە. لەگەڵ ئەوەشدا کە لێی قەوماوەو دڵی توند، بەڵام کە منداڵێك لەسەر بەفرو شەختەکە هەڵدەخلیسکێ دەستی یارمـەتی بـۆ درێژ دەکاو بنهەنگڵی دەگرێ تا راستی بکاتەوە کابرا هەر دەڕواو لەبەر خۆیەوە دەڵێ ((سەختە: بەڵام دان بەخۆمدا دەگرم، سەبری بچووکی خوا چل ساڵە، دەبێ بە جارێـك بیانهەژینم، بێ ئابڕوینە ))

وا دیارە کابرا زۆر سەختی لێگوزەراوە بەڵام لە بێ دەسەڵاتیدا هـیچ چـارێکی نەبووە جگە لە ددان بە خۆ داگرتن ، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە شتەکەی بە ئاسایی زانیـوەوە قبـوڵی کـردوە ، جگـە لەمـە تاوانەکـەش بـە  هـی ئـەوان دەزانـێ کـە لێپرسینەوەیان بەرانبەر بە خەڵکی بێدەرتان نییە و مرۆڤ هەر چەندەی دان بە خۆ یـدا بگری رۆژێك دێ هەر بەروویاندا دەتەقێتەوە بۆیە بەبێ ئابڕو ناویان دەبا.

## نەخۆشی

دایکم زۆری سەرما دەبوو ، لەم کاتەی چرای دادەگیرساند وتی:

ــــ لەشم شین و مۆر هەڵدەگەڕێ ــ مێشکم تەپە.

هەوا سارد بوو. هەموومان لە دەوری مەقەڵەی ئاگر دانیشتبوین. پوورە و مامەپیرەشمان لە کن بوو. خاڵە موساش بە خۆی و موسیبەت نامەکەیەوە هاتبوو. زستان دادەهات. زستان لەگەڵ موسیبەت نامەکەی خاڵەوە دەهات. لەگەڵ دەنگی هەزاران کۆخەوە دەهات. دەنگی کۆخەی نیوە شەوان لەگەڵ دەنگی شکانی گۆزە لە نیوە شەوەساردەکانەوە دەهات.

زستان بۆ ئێمە لە هی خەڵکی گەلێك ساردتر بوو. ئەسخەر لە پشت شووشەی پەنجەرەوە سەیری کلۆ بەفرە تەنکەکانی دەکرد رووی لە ئەکبەر کرد و وتی:

ــــ خۆزگە لە جیاتی بەفر ، گەنمەشامی لە ئاسمانەوە دەباری. مامە پیرە گوێی لێ بوو لە پڕ لە بەندی دڵیەوە هاواری لێ هەڵساو وتی:

ــــ هەی مل شکاو کفر مەکە! هەی گوجیلە[1] سەگ!

دەیەوێ ئەم پاروە نانەشمان لێ ببڕی زمانت ببڕە.

باوکم نالایەوە:

ــــ خوایە سەد گوناح و یەك تۆ بە:

پوورە بە تانە و تەشەرەوە وتی:

ــــ گەنمە شامیت بۆ چییە هەی مەشکەدڕە!

---

١- گوجیلە: توتکە سەگ

خاڵە موسا لە ژێر چاوێلکەوە سەرێکی ئەسغەری کرد لـەم کاتـەش ئەسـغەر لـە ترسان هەڵدەلەرزی ، بە منە منەوە وتی: ـــ ئاخر هەی مـاڵوێران ئەمـە قسـە بـوو کردت!؟

ئەو رۆژە دایکم چەند رست جلی شوشتبوو ، لە سەربان لە حەوشە لەسەر قـەدی دار و کۆلەگە هەڵی خستبوون و وشکی کردبوونەوە قەدی کرد بوون ، لە ناو بوخچەی دانا بوونەوەو بە خاوەنەکانی دابوونەوە.

شەو گیانی شین و مۆر هەڵدەگەڕا. گیانی داغ بوو. باوکم قەدەمی شکا بوو وتی:

ـــ سەرمات بووە ، ئەگەر بپژمی چاك و دەبیەوە. پێویسـتە کـارێکی وا بکـەی بپژمی.

پوورە بە نیگەرانییەوە وتی:

ـــ نیوەڕۆ چیت خوارد ؟ رەنگە ماستی ترشت خوارد بێ:

ـــ دایکم بەناڵەیەکەوە وتی:

ـــ بە خوا جگە لەو پارەو نانە رووتەی بەیانی چیدیکەم نە خواردوە.

زادی دیم نە بڕیوە ، هەر پارە و تانەکەی بەیانی بووە.

مامە پیرە وتی:

ـــ چویتە سەر ئاو ئیمڕۆ دانیشتوی ؟

دایکم لەناو تادا کوڵمی سوور ببووەوە ، لەسەرەخۆ وتی:

ـــ نە ء

مامە پیرە بە بێ ماوەدان وەك ئەوەی شتێکی گرانبە های دۆزیێتەوە وتی:

ـــ ئاها کەواتە دڵە کوتێتە. دەبێ (حاجی مەنیزی) بخۆی.

عەزرا خوشکی تازە بوومان گریا و دایکم بۆ بەر مەمکی خۆی برد.

پورە وتی:

ـــ شیر مەدە منداڵەکە شیری مرۆڤی تادار باش نییە.

دایکم بە میهرەبانیەوە سەیری عەزرای کرد و وتی:

ـــ ئەی بەستە زمان لە برسان دەمری.. ئەدی تۆ چ دەخۆی ؟

باوکم وتی:

ـــ دەبێ بپژمی. پژمین دەرمانی دەردتە. ئەگەر بپژمی هەر سەرمایەکی چووەتە ناو سەر و مێشکت دێتە دەرێ.

پورە وتی:

ـــ ئاخە پیاوەکە ، چۆن بپژمێ، بیرێك لە حاڵی بکـەوە ، خەریکـە وەك کـوورە دەسووتێ ، وەك فلوسی سوری لێهاتوە.

باوکم قوتوی توتنی لە باخەڵی دەرهێنا. پتە توتنێکی رێژتە ناو لەپی دەستی. بە پەنجەرەشەکانی باش هاڕی و پاشدان بە بەر کونە لووتی دایکمی راگرت و وتی:

ـــ بۆنی بکە ، هەناسە هەڵکێشە ، یاڵلا ، ئیستا دەپژمی، بپژمی ئـیش تـەواو دەبێ.

دایکم لووتی رەپێش کردو توتنەکەی بۆن کرد ، لە پڕ پژمی..... ئا پژم... پژم..:

ـــ سەد شوکر و حەمد ئەی شافی.

پوورێش لە پاش مامە پیرە پژمی و رووی لە باوکم کرد و وتی:

ـــ خوا بتگرێ لەگەڵ خۆت و ئەم توتنە توندەی کە هەتە.

دایکم وتی: لوتم گیراوە بۆنی هیچ ناکەم.

ئەسخەر پژمی و لە هەردوو کونە لووتیەوە چڵم دەرپەری و لە جێی خۆی بـە بـێ جوولە وەستا.

خاڵە موسا پژمی و شتێك لە دەمیەوە پرژایە سـەر دوعـا نامەکـەی و یەکسـەر کتێبەکەی قەپات کرد. عەزراش وەك بێچووە پشیلەیەك لمـوزی بـە ئـاگرەوە جزابـێ پژمی و بەلاّم دایکم نە پژمی.

دایکم بۆ بەیانی لەناو نوێن نە هاتە دەرێ. بە یارمـەتی پوورەمـان ژوورەوەمـان ماشت. مەقەڵە ئاگرێکمان گەشکردەوە، دایکمان بە باشی داپۆشی عەزرامان خاوێن کردەوەو غەمگین و سەرگەشتە چوینەوە قوتابخانە.

دایکم نیوەڕۆش هەر نوستبوو. بێ حاڵ و بێ هۆش. بە بێ جووڵـە ڕەنگـی زیـاتر پەڕی بوو ، ناڵە ناڵی بوو. پووره شۆربای بـۆ لێنـا. دایکـم کـەمێکی خـوارد بـەڵام هێنایەوە. دووبارە لە ناو نوێن لێی کەوتەوە.

عەزرامان دایە ژنی خاڵە ئەویش تازە منداڵی ببوو ، عەزرا وردە وردە دە تـاواوە بچووك دەبۆوە، ڕۆژانێکی گەلێ خراپی بەسەر دەبرد.

شەو کە چۆلەکەکان گەڕانەوە هێلانەکانیان و ئەستێرە بەدەر کەوتن.

شەوێ کەیەکەم جار بۆنی نانی گەرم هات و پاشدان باوکم هاتـەوە ، دووبـارە لـە دەوری یەك گربووینەوە و ئینجـا لەســەرەخۆ فســکە فسـك دەسـتی پێکـرد پـوورێ چاوەکانی لەناو گریاندا ببووە دوو کاسەی خوێن بە پەستیەوە وتی:

ـــ شۆرباش کاری نەکرد. دەبێ بەیانی بچمە گوزەری (ساحێب جەمع) ، لە کچی پورە مەعسومە ئاوی موتفەرك وەرگرم.

مامە وتی: هەر نەخۆشییەکی هە بێ ئاوی تور چاکی دەکاتەوە.

باوکم مژی لە جگەرەکەی دەدا و وتی:

ـــ نەختێ تووتن بهاڕم بەڵکە ئیمشە و بپژمێ.

پووره خێرا وتی:

ـــ بۆ خاتری خوا سەرەکەی مەکەوە. دوێنی شەو تا بەیانی هەر پژمیوین.

ڕووی لەمامە پیرە کرد وتی:

ـــ بۆ ئەم سنگە ئیسقادارەش باش نییە.

مامە پیرە بە گرژی ڕووی لە پووره کردو. وتی:

ـــ من ئیسقا دارم ؟ ها! کەس مافی کۆخینی نییە ؟!

خاڵە موسا ئاهێکی هەڵکێشا ووتی.

ـــ با ختمێکی حەزرەتی زەینەبی بۆ بگرینەوە. حەتمەن چاك دەبێتەوە.

پووره بەگریانەوە وتی: ـــ

ـــ حەزرەتی زەینەب بە دەنگمانەوە وەرە.

سەیری نوێنی دایکممان کرد و خەم قورگی گرتین. نانمان خوارد و نووستین.

* * *

سبەینیێ نە چوینە قوتابخانە. بەکۆمەکی یەکتر دایکممان بردە ژووری پوورە و نواندمان. پوورە هێندە گریا بوو چاوی هەڵنە دەهات ، وتی:

ـــ من لە تەنیشت تەختەکەی دەنوم دەبێ زیاتر ئاگام لێی بێ منداڵینە ئێوەش نەیەنە ئەم ژوورەوە. لەشی ئێوە ناسکە ، نەخۆش دەکەون. ئەکبەر و ئەسغەر لەسەر تیکە نانێك لێیان بوو بە شەڕ هەردووکیان بە گریان چوونە قوتابخانە. لەگەڵ پوورەمدا کەوتینە ڕێگا ، بەرەو گوزەری (ساحێب جەمح) ، پوورە جامێکی لەگەڵ خۆیدا هێنابوو. رۆخەکانی ئاشورا بەستبووی. زەوی ببووە چلوورە. بە پێڵاوی لاستیکی سارد. بە یەخەی کراوە بێ قۆپچە و بەو دەستانەی کە هەمیشە بستێ لە قۆڵی چاکەتم هاتبووە دەرەوە ، کەوتینە ڕێگا.

چۆلەکە ترسنۆکەکان لەسەربان هەڵنیشتبوون ، هەتاوی بێ تاو و تین لە دیوارەکانی دەدا. لەگەڵێ شوێن سمی چوار پێ لەسەر شەختە مابۆوە. دوکاندارەکان وەك مریشك خۆیان وێك هێنا بۆوە و دەستەکانیان بەسەر مەقەڵەی ئاگر داگرتبوو.

گوزەری ساحێب جەمع. پوور مەعسومە و یەك جام ئاوی تور بۆ شیفای دایکم. بە خۆشحاڵی گەڕاینەوە. دەرمانی دەردی دایکم لەناو لەپی پورم دا بوو. کەیف خۆش بووم حەزم دەکرد نانێکی سەر تەختەی نانەوا خانەکە هەڵگرم و گازێکی لێبگرم.

شەوی سێیەمی نەخۆش کەوتنی دایکم بوو. هەموومان چوو بووینە ژوورەکەی پوورەوە دانیشتبووین. پوورە ئیستیاکانێك موتفەڕکی بە گەوری دایکم دا کرد، بەلاّم ئێستا لە قوڕکی نە چوو بووە خوارێ کە هێنایەوە. موتفەرك دایکمی چاك نەکردەوە.

مامە بە توندی کۆخی و بە هەر دوو ئەنگوستی گەورەو شادەی ئیشارەتێکی بۆ پوورە کردو وتی:

ـــ ئیستیکانێك لە و توراوە... بۆ سینەم... ڕەنگە.

باوکیشم ئحمێکی کرد و هەر وەك مامە ئیشارەتێکی بۆ پورە کرد:

ـــ نیو ئیستیکانیش... سەرما...

خاڵە موسا بە زۆر قرقێنەیەکی هێناوە و بە پورێی وت:

ـــ دایە هێندەی ئەنگوستیلەیەکی دورمانیش بۆ من تێکە.. ئەکبەر لەسـەرەخۆ بە پورەی وت:

ـــ کەمێکیش بۆ من تێکە ، رەنگە بۆ دەرسەکانم باش بێت.

جەدوەل زەربم بۆ ئەز بەر ناکرێ پورە بەو پەڕی سەخاوەتەوە ئیستیکانێکی تـوراو لە نێوانیاندا دابەش کرد و ئەوی دیکەشی بە پارێزەوە لە ناو دەلاقە دانا.

دایکم دووبارە حاڵی تێکچووەوە و ئیستیفراقی کرد.

پوورە رووی لە مامە پیرە کرد و وتی:

ـــ سێ رۆژە هیچی نە خواردوە هەر کەفی رووت دەهێنێتەوە. چبکەم یا قەمـەر بەنی هاشیم. کەس نوقەی لێوە نەهات و پوورە بڕیاری دا بـۆ ڕزگـار کردنـی دایکـم کەلوپەلەکانی حەمامی خۆی بفرۆشێ و دکتۆری بێنێتە سەر.

بە دڵ تەنگیەوە بە رۆخ ژوورەکەی پوورە تێدەپەڕیم و لە درزی دەرگاوە تەماشـای دایکمم دەکرد. دەنگە ناسك و میهرەبانەکەیم بەر گوێ دەکـەوت. ناوژوورەکـە نیـوە تاریك بوو. دایکم رووی لە بنمیچ بوو. دەستە لاواز و ئێسقانیەکانی بە بـێ حاڵیـەوە کەوتبووە سەر جاجمەکە هەر کاتێك گوێم لە دەنگی دەبوو بـە خـۆم دەوت: (هێشـتا دایکم هەیە. هێشتا زیندوە ).

دایکم بە دەنگە نەخۆش و دڵنەوایەکەی ، ئەو شـیعرەی دەخوێنـدەوە کـە پـوورە مەعسومە فێری پوورەی کردبوو ئەویش بۆ دایکمی وتبۆوە پێی لەبەر کرد بوو. پوورە مەعسومە و تبووی هەر نەخۆشێ سێ جـار شـیعرەکە بخوێنێتـەوە چـاك دەبێتـەوە. دایکم هێندە بە پاکی و سادەیی دەیخوێندەوە مـن لەپشـت دەرگـای ژووری پـوورەوە گریانم هات. گریان بۆ باشیەکەی ، بۆ رەنجەکانی ، بۆ مندالە تازە بووەکەی بۆ سـکە هەمیشە برسیەکەی و بۆ قژە شانە نەکراو و تیتك تیتکەکەی. دەنگە سـۆزاوییەکەی دایە لەو ژوورە نیو تاریکەی دەمە دەمی رۆژ ئاوا دەگەیشتە گوێم:

ئەی مانگی بەنی هاشم ، ئەی تیشکی رووی عەباس
ئەی نوری دڵی حەیدەر، شەمعی شەهیدان عەباس
**ئەی شاهی عەلەم هەڵگر**
**ئەم دەردەی کە دەیبینی**
**لەسەر دڵی من هەڵگر**

کە دکتۆر گەیشتە ماڵمان ، تەنیا دەنگی چۆلەکە دەیبسترا. دەمزانی کە هەر کەسێك نەخۆشییەکانی سەخت بێ ، پزیشکی دەهێننە سەر. ئەو وەختە مامە عەلی بەقاڵ دەمرد پزیشکیان بۆ هێنا. خەڵکی گەڕەکەکەمان هەمیشە لە دوا هەناسە بانگی پزیشکیان دەکرد. ئەمەم دەزانی، بەلاّم دیسانەوە ئومێدم هەر هەبوو. هەرگیز باوەڕەم نەدەکرد دایکم بمرێ ، ئەدی کێ جلی خەڵکی دەشوشت ؟ ئەدی کێ کلاّشی بۆ خەڵکی دەچنی ؟ کاتی کە بزێویمان دەکرد کێ لا ڕانەکانمانی بە قونجرکە شین بکردباوە کێ لەبەر باوکم دەپاڕاوە تا جەژن جووتێ گۆرەویمان بۆ بکرێ ؟ بە هیچ جۆرێك نەدەبوو دایکم بمرێ.

دەبوایە ئەو بژی تا قاپ و قاچاخ بشوا. ماڵ بماڵی عەزرا شیر بدا و خەم و دەرد قوت داتەوە ناو هەناوی. بەدەستە تەزیوو شەقار شەقارەکانی خۆی هەموو شەوێ وازەنینمان تێهەڵسوێ. چیرۆکمان بۆ بگێڕێتەوە. چیرۆکی خۆش. چیرۆکی ئەو چۆلەکەی کە باران هات و هێلانەکەی، هێلانە کاغەزینەکەی وێران کرد. چیرۆکی ئەو لاوەی کە ئەژدیهاییێکی کوشت ئەو ئەژدیهایەی کە بەری ئاوی گرتبوو و دەبوایە مرۆڤێك بخوا تا نەختێ بجووڵێ و چۆڕە ئاوێك بەرداتەوە.

دایکم دایکێکی باش بوو. هەمیشە دەستەکانی بۆن سابوونی لێدەهات بۆنی پارەی خوردەی لێدەهات و هەمیشە پڕقلێش بوو دەردەدار بوو.

لە درزی دەرگاوە سەیرم دەکرد. پوورە کەوتبووە سەر دەست و پێی پزیشك و پێلاّوەکانی ماچ دەکرد. وەك ئەمەی بایەکی پەنگ خوارد و پیسم لە دوو تویی سنگدا بێ و خاڵی بوو.

پزیشکەکە بن هەنگڵی پوورەی گرتبوو و دەیوویست هەڵی ستێنێتەوە. پوورە دەگریا و چارۆکی سەر سەری کەوتبووە خوارێ

❊ ❊ ❊

که شەو داهات باوکم لە ئیش گەڕاوە، قورئانێکی هێناو ووتی:

ـــ دایکتان حاڵی خراپە. بێ هەست و هۆش کەوتووە. خێراکەن دەبێ لەسەر بان دوعای بۆ بکەین. ئەم قورئانە لەسەر سەری ڕابگرین و بگریەین.

لەو شەوە تاریك و شەختە بەندانەدا ، کەوا ئاسمان پڕ لە ئەستێرە بوو و شار سەری خستبووە سەر سەرینی گەرم و نەرمی خەڵکەکەی سەرەوەی شار و پێیە خاوسەکانیشی لە سەر حەسیرە ساردەکەی ئێمە دانابوو. لەگەڵ باوکمدا لە قوژبنێکی سەرباندا هەڵتروکاین. باوکم قورئانەکەی لەسەر سەریەوە گرتبوو دەگریا. یەکەمین جار بوو ببینم باوکم بگریە هەنسکی دەهاتێ و بە سەر دەستی چاکەتەکەی ، لووتی دەسڕیەوە و دەیووت:

ـــ خوایە... ئەی خوا.. مەکە مەکە.. ئەم مندالأنە... مەکە مەکە...

وەك ئەمەی یەکێك ئازاری بدا بێ پسانەوە دەیوت: ((مەکە مەکە )).

من و ئەکبەر و ئەسخەریش کەوتبووینە گریان. پوورە عەزراشی بە مەلۆتکەوە لە قادرمەوە هێنا سەرەوە. تا خوا عەزراش ببینێ و بزانێ کە عەزرا شیری نییە و ناتوانێ بێ دایك بژی.

❊ ❊ ❊

لە دوورەوە دەنگی ئاوازی مۆسیقا دەهات. دەنگی دمبك دەهات و ناڵەی ئێمەش نە دەگەیشتە هیچ کەس. هەموومان بە نۆبەت قورئانمان بەسەر سەرمانەوە دەگرت و دەگریان.

عەزرا دەیویست بە دەستە بچووکەکانی ئەستێرەکان بگرێ، بەلاَم نەیدەتوانی، کەڕەتێك دەگریا و جارێك پێدەکەنی. دیسانەوە دایکم حاڵی خراپتر بوو.

❊ ❊ ❊

هەموو شتێکمان فرۆشت و لە ئەنجامدا بە دەرزی و داو و دەرمان و پزیشك دایکم لە نیوەی ڕێگای مەرگ گەڕاوە. هەموو ڕۆژێك لە درزی دەرگاوە دایکم دەدیت. پوورە پێی وتبووم نەچمە ژوورەوە چونکە نەخۆشی دایکم درم[1] بوو.

دایکم تێك قوپا بۆوە هێندی چنگێکی لێهاتبۆوە. قژە جوانەکەی لە ڕەگەوە وەریبوو و سەری کەچەڵ ببوو. دایکم لەناو نوێن دەهاتە دەرەوە. بە هەردوو دەستی خۆی بەسەر زەویدا دەخشاند.

ڕۆژێکیان کە خەریکی تەماشا کردنی بووم ، بەم شێوەیە خزیەوە. چووە پشت پەردەو لەسەر سفرە کوتە نانێکی هەڵگرت و گازێکی لێدا. لە خۆشیان دەستم بە دەرگا کەوت و دەرگا کراوە. دایکم منی بینی. پەشۆکا. بە نیگایەکی پڕ لە پاڕانەوە و چاوەکانی لە زەوی بڕی و نالآیەوە:

ـــ ئەشرەف تو خوا بە پوورە مەڵی دایکم نانی خوارد.

* * *

دایکم چاك بووە و دووبارە لە ڕۆخ حەوز دانیشتەوە بۆ جل شۆرین. عەزرای بچکۆڵە و لەڕو لاوازیش لە ڕۆخ تەشتی کوڵکردنی دایکم کەوتە خولانەوە.

---

١- درم: ئەو نەخۆشیانەی لە یەکێکەوە دەڕوا بۆ یەکیکی دی.

## هاوكات لەگەڵ كۆخە كۆخی باوكمدا

خوا خوامە زووتر نیوەڕۆ دابێ. گەرم دادێم. کوورە داغەو گڵپە دەکا. بابم قاڵبەکان پڕ لە لم دەکاو باشیان دادەگرێ تا سفتوسۆ بێ. عیسا قاڵبەکان بەریز لە ناوەڕاستی دوکاندا دەچنێ. قاڵبی سووربۆوە بە مقاشی گەورە گەورە دەگرن و لە کوورەی دەردەهێنن. قاڵب ڕەنگی لە ڕەنگی هەتاو دەچێ. ناتوانم بە باشی تەماشای بکەم. دەموچاوم سوور دەبێتەوە. تینووم دەبێ. عیسا و بابم بۆتەکان بە کێش دەهێنن و بە هاوکاری یەکدی و لەسەرەخۆ لە قاڵبانی دەڕێژن. هەر کە بۆتەکە تەکان دەخوا کەمێکی لێ دەڕژێتە سەر زەوی دووکەڵی لێهەڵدەستێ ئارەقە لە سەری لووتی بابمەوە دەتکێتە ناو قاڵبەکانەوە.

ئارەقە دەچێتە چاوەکانی عیساو لەتاوانا توند توند چاوەکانی هەڵدەگلۆفێ و دەیانکاتەوە وەك دەرمانی لە چاوان کرابێ. هەموویان ڕووتن و ئارەقە کە دەڕژێتە ناو شەرواڵیان.

زۆر گەرمە. دڵم تێك هەڵدەچێ. بۆن کزی مس و ژەنگی ئاسن و نەوتی ڕەش تێکەڵ یەکدی دەبن و هێڵنجم دێتێ. شتێکی ترش دەڕژێتە قوڕگمەوە ، بەڵام قوتی دەدەم. هەر ئاودەخۆمەوەو ئارەقە دەکەم.

بیری قوتابخانە دەکەمەوە. قوتابخانە زۆر خۆشترە مرۆڤ بۆ خۆی لەبەر سێبەر لە ڕۆخ تەختەڕەشی ساردو فێنك لەسەر کورسییێکی تەختە دادەنیشێ ، خۆ ئەگەر ئەو جەدوەل زەربە نەبایە ئەوا زۆر خۆشتریش دەبوو. جەدوەل زەرب وەك کوورەی ئاسن تواندنەوە ئارەقە بە مرۆڤ دەکا.

من حەزم لە قوتابخانەیە. کە هاوین دادیٚ ، دلٚم دادەخورپیٚ. بابم دەپرسیٚ:

ـــ کەی قوتابخانە تەواو دەبیٚ ؟

ـــ من گەرم دادیٚم و ئارەقە دەکەم و دەلٚیٚم: ((تاقیکردنەوەیەکمان ماوە)) کە تەواوام کرد

بابم لەگەلٚ خۆی دەمباتە دوکان.

بابم و عیساو مامە کاهی پیٚکەوە لە کوورەی تواندنەوەی کانزادا کاردەکەن. عیسا تازە سەربازی تەواو کردوە ، مامە کاهی چاوی بە هەرچی بکەویٚ دەلٚیٚ: ((ئەمەیان پووشکەیەك ناهیٚنیٚ ))

هەر لەبەر ئەمەیە ناویان ناوە مامەپووشکە ، ئیٚمە هەموومان بۆ مام قاسم کاردەکەین. کە پیٚی دەلٚیٚن قاسمە کویٚر ، چونکە چاویٚکی کویٚرەو ئەمەش هی سەردەمی لاتی و چەقۆ کیٚشی بووە. سەروەختیٚك کەشار قەرەبالٚخ دەبیٚ خۆی و چەند لات لووتیٚکی دیکە بەچەقۆ پەلاماری مامۆستاو نووسەریٚك دەدەن. دوای ئەوە دەولٚەمەند دەبیٚ و کاری باش دەبیٚ. دوکانی کوورەگەریەکە هی ئەوە. ئەو دوو دیزل و تریٚلەیەکی هەیە. قاوە خانەو قومارخانەیەکیشی هەیە. مامە پووشکە دەلٚیٚ: ((قاسمە کویٚر ئیمسالٚ دەچیٚتە حەج ، بەلاٚم پووشکەیەك ناهیٚنیٚ )).

من عیسام خۆشدەویست ، هیچ شتیٚکی بە تەنیا نەدەخوارد بەشی من و باوکم و مامە پووشکەشی دەدا. ئەو لە سەرکاردا گۆرانی عاشقانەی دەگوت و بەدەستەسرِەکەی شیٚوەی مشکی دروست دەکردو منی دەهیٚنایە پیٚکەینن. ئۆتۆمبیلیٚکی باری چکۆلەیشی بۆ من دروستکردووەو کە دەستم بەتالٚ دەبیٚ لەبەردەمی دوکانەکە یاری پیٚدەکەم ، کە تریٚفرۆش دیٚ هەموو کریٚکارەکان لە دەوری یەکدا کۆدەبنەوە پیٚشبرِکیٚی تریٚ خواردن دەکەن ، تا بزانن کیٚ تریٚ لە هەمووان پتر دەخوا. باوکم بەشداری ناکا.

عیسا جارێکیان پێشبڕکێی کردو دۆڕا. مامە پووشکەش قەتارەییەك ترێی خواردوو خەریك بوو بیباتەوە ، بەلاّم لە هیکڕا هەمووی هێناوەنەوە ، گوتی: ((ئەم کارە پووشکەیەك ناهێنیّ )).

مامە کاهی ژنی مردووەو تەنیا دەژی. کوڕەکەشی کەلە قەسری شیرینەوە یاری مندالاّنی بە قاچاغ هێناوەو گوللەی بەرکەوتووەو کوژراوە ، مامە کاهی هەموو دەم بە یادی ئەو ئاخ و ئۆف هەڵدەکێشیّ و دەڵیّ: ((ئەم ژیانە پووشکەیەك ناهێنیّ )) مام کاهی پێیەکانی ژان دەکەن ئاوساون و دوای فراوین لەناو دوکاندا تریاك دەکێشیّ.

عیسا زۆر ژیرەو باش کاردەکا پیرەدایکێکی هەیە کە هەندێك جاران دێتە ناو دەرگای دوکان و لە عیسا پارە وەردەگریّ دەشیەویّ ژن بۆ عیسا بێنیّ.

هەمیشە خۆی قوربان و سەدەقەی عیسا دەکاو لە خودا دەپاڕێتەوە کە دەردی عیسا بێتە گیانی ئەو.

کە نیوەڕۆ دادیّ بابم کوورەکە دەکوژێنێتەوە. کوورە دەرفێنیّ و فیکان دەکێشیّ دووکەڵ و هەڵمی لیّ بەرزدەبێتەوە. ناو دوکان پڕی دووکەڵ دەبیّ. ماشائەڵلاّی تارژەنیش دێت و کیسە سازەکەی دوور لە کوورە بە دیواری دوکاندا هەڵدەپەسێریّ.

ئابڕوومەندیش هەیە کە دەڕۆزە دەکاو داماوەو نیوەڕۆیان دێتە لامان و نانمان لەگەڵدا دەخوا.

عیسا پارو دەگریّ و بەناو دوو کولّەکەی دوکانی دادەهێنیّ و دیخواو دەڵیّ: ((تەنیا نان و دووکەڵ من تێردەکەن. ئەوەندە نان و دووکەڵ دەخۆم تا پارەیەکم ببیّ و بتوانم ژن بێنم )) ڕۆژێك نان و خەیار دەخۆین و ڕۆژێکی دیکە نان و خورما و لە خودا دەپاڕێمەوە کە خوایە ئێمڕۆ باوکم کەباب بکڕیّ ، کاتیّ کەباب دەخۆین هەموومان خۆشحاڵین.. ماشەڵلاّی تارژەن دوای فراوین چاییێکی بە ڕەنگ دەخواتەوەو سازەکەی لەناو کیسە دەردەهێنیّ و دەستدەکا بەژنینی و گۆرانییەکی غەمگین دەچڕیّ کە من لە شیعرەکەی دەترسم ، چونکە لەناو گۆرانییەکەدا قسە لەگەڵ خاك دەکاو بەمجۆرەیە:

به گورەستانێك دا تێپەڕیم سەر لە بەیانێك          دەهاتە گوێم بە کولّ ئاهو نالّەو فیغانێك
کەدیتم کەللە سەرێك بوو بە خاکی دەگوت          کە دنیا ناهێنێ پووشی کادانێك

مامە کاهی زۆری کەیف بەم شیعرە دێ و لە سەرەخۆ دەڵێ : (( ئافەرین بۆ ئەم شاعیرە دیارە ئەم شاعیرەش وەك خۆمانە)).

باوکم بە دەنگی تارەکەی ماشەڵلاّ کەیفی سازدەبوو کوّلّێ دەبووژاوە ، هەندێ ڕۆژان تارەکەی لێ وەردەگرت و کەمێکی دەژەند بەرە بەرە خەریکە فێردەبێ و شتانێکی وادەژەنێ کە من کەیفم پێیان دێ. دوای فراوین هەر کەسە بۆ خۆی ئیسراحەتێك دەکا ، تا قالّبەکان سارد ببەنەوە.

* * *

ڕۆژێك کاك قاسم هاتە دوکان و بە باوکمی گوت: ((کوڕێژگەکان بنێرە پشت باغی ئاورییشم. هەندێ قەوانە گوللە تۆپ لەو ناوەن و با کۆیان بکەنەوەو بیانهێنن )).

من و مامە کاهی عیسا دەچین و هەرچ قەوانێکی لەو ناوەبێ کۆیان دەکەینەوە. سەربازێك لەوێ وەستاوەو نایەڵێ نزیکتر بیتەوە، بەلاّم کە ناوی کاکۆ قاسم دەهێنین دەنگ ناکا. کە دێینەوە ، لەسەر ڕێگای خۆماندا سێ چلوورە دەکڕین و دەیخۆین. ددانەکانی مامە کاهی دەتەزێ و ئاوی بە چاواندا دێتە خوارو دەڵێ کەللەم تەزیوە ، بەلاّم من زۆر چێژ لە چلوورە وەردەگرم. چەند جارانم بە بابم گوتووە کە لێگەڕێ چلوورە بفرۆشم ، بەلاّم ئەو رازی نابێ.

دایکم شەوان چیرۆکم بۆ دەگێڕێتەوە. کە دەچمە ماڵی داپیرە ئەویش چیرۆکم بۆ دەگێڕێتەوە ، دایکم زۆر کاردەکا. چێشتمان بۆ لێدەنێ و جل و جۆری خەڵکی دەشواو مەچەکی ژان دەکەن باش نابنەوە. لە هەر کوێیێك زەماوەندو بووك بێ ، دەچێ کاردەکا شەوێ کە دێتەوە گۆشتی برژاو و پلاّومان بۆ دەهێنێ و شیرینی بووك لە لچکێکی چارۆگەکەی پریاسکە دەکا و دەیهێنێتەوە ماڵ.

دایکم جێگایەکی دیکەیشی دێشێ کە دڵێەتی. دەڵێ ئەم دەردەیانم زۆر کۆنە. کە قلپی دێتێ بۆنی حەمام لە دەمی دێتەدەرو دەڵــێ: (ئوخــەی ســەرودڵم ڕحــەت بــوو. هەموو ئەم بایە بوو).

بەڵام دیسان سکی بادەکاتەوە ، دایکم شەوان حیکایەتم بۆ دەکا خۆی پــێش مــن خەو دەیباتەوەو منیش تەماشای ئاسمان دەکــەم. کــە دایکــم نــەخۆش نــەبێ ڕێگــای مەکەم لە ئاسمان نیشان دەداو دەڵێ: ((سەردەمانی زوو ئۆتۆمبیل و فڕۆکــە نــەبوو ، ئەم جادەیان باشتر دیار بوو ، بەڵام ئێستا خەریکە لە نێو دەچێ و کوێردەبێتەوە )).

هەر تەماشای ئاسمان دەکەم، حەزدەکــەم بــە نێــو ئەســتێراندا بــڕۆم. داپــیرم زۆر خۆشدەوێ. ئەو سەرمان لێدەداو چای بە ڕەنگ و ســەنگین دەخواتــەوەو شــیرینیم بــۆ دەهێنێ. داپیرەم ســپیاوی حــەمام لــە ماڵــەوە دروســت دەکــا و دەیفرۆشــێ. نەنــەم بووکەشووشەی جوان بە پارچە قومــاش و مــۆری دروســت دەکــا و شــەوانی هــەینی دەیانباتە سەر گۆڕی ئاغاو دەیانفرۆشێ. نانی تیری لە گۆشتاو دەکوشێ دەیخــوا هــەر لەبەر ئەوەی نەرمە زۆری حەز لێدەکا ، ئەو ددانی نەماون بەڵام من حەزی لێناکەم ، چونکە دوگ و بەز لینج و لوسن و هێنجم دێتێ ، نەنە نێرگلــە دەکێشــێ و مــن زۆر تەماشای ناوەکەی دەکەم. بووکە شووشەیەکی بچووك لەناو ئاوی شووشەی نێرگلەکــە دایە ، کە نەنکم مژ لە نێرگلەکە دەدا ، بووکەشووشەکە دێتە سەما و لــەناو ئاوەکــە هەڵبەزودا بەز دەکا ، هەر کاتێ کە داپیرە لە ژوورێ وەردەکەوێ من سەری نێرگلەکە بە لێومەوە دەنێم و فووی تێدەکەم ، بەڵام بووکەشووشەکە سەماناکا نەنەپیرەم دێتەوە ژوورو قڕە قڕێك دەکا و دەڵێ کێ دەستی لە نێرگلەکەم داوە. من بێدەنگ دادەنیشم و هــیچ نــاڵێم ، داپــیرەم دەڵــێ: (( دەکەواتــە ئــەو مشــکە ئــاگری نێرگلەکــەمیان کوژاندۆتەوە!)).

* * *

ناو دوکان گەرمە و کوورەش هەر نێڵە نێڵێەتی. دەمــی بــاوکم دەجووڵــێ و مــن گوێم لە هیچ نییە. عیسا لە کوورەکە نزیکە و بە بێڵۆکە چەند کانزایەکی لــە کــوورە

دەهاویێ. باوکم لە ناوەڕاستی دوکانەو خەریکە لەگەڵ عیسا قسەدەکا. مامە کاهی دەنکە زیخەکان لە گۆشەو کەناران کۆدەکاتەو بەم لاو ئەو لای قالبەکەندا هەڵیان دەچنێ. من لەبەر دوکاندا وەستاوم تا کەمێ فێنکم بێتەوە. لە پڕێکدا زرمەیەکی گەورە دێتە گوێ و عیساو بابم هاوارێکی وایان لیهەڵدەستێ کە تا ئەم کاتە گوێم لە هاواری وانەبووە. مامە کاهیش ئاخێکی گەورە هەڵدەکێشێ ئەم ناوە هەمووی دەبێتە چڕە دوکەڵ و ئاگر. گوێکانم تەپ دەبن وەك ئەوەی کە دوو دانە زەنگی قوتابخانە لەناو گوێیەکانم لێبدرێن. دەنگ دەداتەوە. نازانم چی روویداوە. خەڵکی دەڕژێنە ناو دوکانەکەمان، باوکم و عیسا کە سەرو دەموچاو و ریشیان خوێناوییەو هەڵم و دووکەڵیان لێ بەرزدەبێتەوە دەستیان دەبەن بۆ ئەوەی ساپیتەی کوورەکە کە کەمێك خراپ بووەو ئاگری گرتووە ، بکوژێننەوە. دەڵێن شتێك لەناو کوورەدا شەقی بردووەو تەقیوە ، بەڵام دیار نییە چی بووە.

یەکێك دەڵێ کە ئەم ڕووداوە سەروبەندی بە قەوانی گوللە تۆپەکانەوە هەیە ، مام کاهیش کە پشتی سووتاوە بە کووڕە کووڕ بە دوای ئەواندا دەبەزێ و ئاخ و ئۆف و ناڵە ناڵیەتی و کەسێك بن هەنگڵی دەگرێ و راپێچەکی دەدا من ڕادەکەمەوە ماڵ و بەدایکم خەبەر دەدەم. دایکم بەسەرو کۆپەلاکی خۆی دادەدا. پێکەوە دێینەوە بەر دەرگەی دوکان.

قاسمە کوێر لەوێدا وەستاوەو دەستەکانی لە کەمەری ناوەو تەماشای کوورە وێرانەکە دەکا جوێن دەدا ، قسەی خراپ بە بابم و عیسا دەڵێ و منیش زێتر قێزم لێیی دەبێتەوە. ئەو کەسێك لە دوکانەکە دەکاتە دەرەوەو دوکانەکە دادەخاو دەڕوا.

دایکی عیساش لە حاڵێکدا کە بە هەردوو دەستی بە سەرو مێژلاکی خۆیدا دەکێشێ بە گریەو زاریەوە دێ. کرێکارەکان دڵی دایکم و دایکی عیسا دەدەنەوە.

بەڕاکەراك بەرەو شێرو خورشید دەچین. لەنێوان خەڵکەکەدا نازانم کەسێك دەڵێ چی کە دایکی عیسا شینو شەپۆریەتی و خاکی باخچەکەی پێشمان بەسەری خۆی دادەکاو دەموچاوی خۆی دەڕنێتەوەو دەڵێ: ((ئای کوڕیژگەکەم ، چیت بەسەرهات.

دەمویست ژنت بۆ بێنم. ئای نان پەیدا کەرەکەم کوڕێژگە ناکامەکەم. قوربـانی دەم و لێوە تینوەکانت بم خۆزیە دەکرا جارێکی دیکەش دەستەکانت ماچ کەمەوە. بە تەنیام جێنە هێڵی بە بێی تۆ فیراقی ڕەش دەکەم )).

خەم دامدەگرێ و لە کوڕژنی گریان دەدەم ، دایکم بە دەم گریـان و شـیوەنەوە لـە دەرگاوانەکە دەپاڕێتەوە کە لێگەڕێ بچـنە ژوورەوە ، بـەلاّم دەرگەوانەکـە نـاهێڵێ و دەڵێ: شتێکی وانییە دایەگیان چاکدەبنەوەو چەند رۆژێکی دیکە دەردەچن.

تا ئێوارە لە پشـت دەرگـا دەوەسـتین و دایکـی عیسـا بـە قسـەکانی دەرکـەوان هێوردەبێتەوەو و فرمێسکی چاوانی دەسڕێتەوەو لەگەڵ دایکم پێکەوە دەکەونە قسە و باسان و دەردی دڵیان هەڵدەڕێژن و پێکەو دوعا دەکەن و سفرەی حەزرەتی عـەلی لـە خۆیان دەگرن. دایکی عیسا دەڵێ: ((چاویان لە کووڕەکەم داوە ، ئومێـدەوارم ئـەوەی ئێرەیی پێدەبا و چاوی پێی هەڵنایە شەقببا )).

شەو بە دڵێکی پڕ خەم و نائومێییەوە دەگەڕێینـەوە مـاڵ. دایکـی بـە گریانـەوە دەڕوا. دایکم لە خەو ڕادەپەڕێ ڕاستدەبێتەوە و تەماشایێکی ئاسمان دەکـا تـا بزانـێ کەی رۆژ دەبێتــەوە. دڵـم زۆر دەگوشـرێ و بـە یـادی عیسـاو بـابم لەبـەر خۆمــەوە سەردەنێمە گریان و خەو دەمباتــەوە. بـەیانی زوو دایکـم بێـدارم دەکاتـەوەو دەڵـێ: ((هەڵسە با بە سۆراغی باوکە بەدبەختەکەتدا بڕۆین و بزانیین چی بەسەر هاتووە )).

هەر کە دەگەینە ئەوێ دەرگەوانە کە دەڵێ: ((کووڕە جحێڵەکەیان کە ناوی عیسا بوو مرد و بەیانی زوو تەرمەکەیان داوە دایکی. دوای ڕۆیشتنی ئێوە دایکی عیسا بە خۆیو و چەند کەسێکی دیکە گەڕاوەو تا بەیانی لێرە بوو. بەلاّم ئەوەکەی دیان حـاڵی باشترە )).

بەرەبەری نیوەڕۆ بوو دەرگەوانە کە دیتی ئێمە لە جێی خۆمان نابزوین و بەردەوام سەرمان لە گریان ناوە چوو تەلەفونێکی کرد و مۆڵەتی وەرگرت بۆ ئـەوەی ڕێگامـان بدا بچێنە کن باوکم.

بابم لەسەر تەختێك درێژ بووەو سەریان بە شتێكی سپی پێچاوەتەوەو تەنیا ددانەكانی دیارن. دەستەكانیشیان پێچاوەتەوە. ئێمە نابینیّ، لێوەكانی ڕەنگیان لەبەر بڕاوە. بە ئاستەم شتێك دەڵێ و ناڵەیێكی لێوەدێ و قسە لەگەڵ دایكم دەكا و هەر داوای ئاو دەكا و لە عیسا و مامە كاهی و من دەپرسێ ، من بە دەنگێكی بەرز سەلامی لێدەكەم و پێی دەڵێم من باشم. دایكیشم پێی دەڵێ هەموویان باشن. لێی جیا دەبینەوە.

هەفتەی دوو جاران سەری لێدەدەین و جارێك بەستەنی و جارێكیان سێوی بۆ دەكڕین. بابم سێوێكیان دەداتە من. لەسەرەخۆ قسەم لەگەڵ دەكا و پێم دەڵێ: ((ئای كووڕە شیرینەكەم نارەحەت مەبە )).

لەتاو بوغزی دڵم سەردەنێمە گریان و وەك دایكم دەكەومە ماچكردنی پێیەكانی باوكم. سێوەكە لەناو دەستم گەرم دادێ. دڵم سێوەكە نابا. كە دەگەمەوە ماڵ ، نیوەی دەدەمە دایكم. زۆر بیر لە عیسا دەكەمەوە بیری دایكی دەكەم و زۆر دڵتەنگ دەبم.

مامە كاهی پشتی سووتاوەو لە ماڵەوە كەوتووەو هاوسێكانی چاویان لێی دەبێ. لەگەڵ دایكم سەری لێدەدەین و شووتی بۆ دەكڕین.

بابم لەوە گەیشتووە كە عیسا چی بەسەر هاتووە ، ئێمەش دەزانین كە باوكم كوێر بووە. دایكم هەرزۆرتر و زۆرتر كاردەكاو دەردەدڵی پتر دەبێ و زێتری قلْپ دێنێ. ڕۆژێك لەگەڵ دایكم چووینە لای قاسمەكوێر. شەڕو دەعوای لەگەڵ دەكەین پێمان دەڵێ: ((دوكانەكەتان وێران كردم و ئێستا چیتان لە من دەوێ ، بڕۆن وازم لێبێنن )).

دایكم جوێنی پێدەدا و منیش لە قەیەك لە ئۆتۆمبێلەكەی دەدەم. ڕۆژێكیش لەگەڵ دایكم چووینە سەر گۆڕی عیسا. زۆر قەڵەباڵغ بوو. هاوسێكانی كچۆڵەیەكیان كرد بووە بووك و لەناو ژوورێكی ڕەش و تاریكیان دانا بوو و وێنەی عیسایان بەرانبەر ژوورەكەدا نابوو ، هەموویان دەگریان ، بە جۆرێك دڵی بەردیشی دەكردە كەباب. دایكی عیسا چەند جاران لەخۆ دەچێ و ئاوی بەدەم و چاویدا دەپرژێنن و باوەشێنی

دەکەن. باوکم دەهێننەوە ماڵ. من دەستێکی دەگـرم و دایکـم دەسـتەکەی دیکـەی. باوکم دەستەکانی زۆر گەرم و داغن ، دەڵێ کوورەی ئاگرن ، جێی برینـەکانی بەسـەر دەستەوە ماون و ناسکە گۆشتی دیارن. ماشەڵڵای تارژەن دێتە ماڵمان و لە کن باوکم دادەنیێشێ و تاری بۆ دەژەنێ و گۆرانی بۆ دەڵێ. ماشەڵڵا بە بـاوکم دەڵـێ: ((شـتێك دڵم دەگوشێ و ئیدی ناتوانم تار لێدەم ، دەسـتم دەلـەرزێ ) تارەکـەی بـۆ بـاوکم بـە جێدەهێڵێ و دەڕوا. باوکم لەسەرەخۆ دەست بە ژێیـەکان دادێنـێ و شـتێك دەژەنـێ. ماوەیەك ماشەڵڵا نایەتە لامان.

خەبەریان هێنا کە شەوێك لە قاوە خانەیەکدا نوستووەو مردووە. ماشەڵڵا کەسـی نییە و تارەکەی بۆ باوکم بە جێدەمێنێ.

* * *

باوکم لەناو جێگا ڕاست دەبێتەوە ، ڕۆژێك پێی گوتم بابچـینە قەسـری شـیرین. دەستی دەگرم و پێکـەوە دەڕۆیـن. لـە قەسـری شـیرین تـوورەگەیـەك چـا دەکـڕین و دەیهێنینە کرماشان و دەیفرۆشین. لە پاسگەکان کـاتێ مـەئموورەکان دێنـە پێشـەوە قسە لەگەڵ باوکمدا ناکەن دەسـتێك بـە کیسـە چـایەکەدا دەهێـنن و تەماشـایەکی چاوەکانی باوکم دەکـەن و دەڕۆن. هـەر ئەوەنـدە چـای دەهێـنین کـە خـەرجی ئێمـە دەربێنێ.

دایکم حاڵی ڕۆژ لە ڕۆژێ خراپتر دەبێ. لە گۆشـەیەکی ماڵـێ کـەوتووەو داپـیرەم سەراسۆمان دەکا و ئاگای لێی دەبێ.

جارێکیان کە لە قە سری شیرینەوە دەهاتینـەوە قاچاغچـییێك تۆچـایەکەی خـۆی لەژێر قاچی باوکم دانـاو چـەند چاکەتێکیشـی لەبـەر کـردین تـاوەکو چـایەکەی لـە پاسگەکە بۆ دەرباز بکەین. باوکم شەرمی دەکرد ئەوە قبووڵ بکا. پۆلیسەکان پێیـان زانی و ئەو قاچاغچییەیان لەگەڵ خۆیاندا بردو پێیان گوتین چیدی نابێ شمەك بێنین.

ئەو ڕۆژەی کە حاڵی دایکم کەمێ باشتر دەبێ لە چـواردەوری یـەك دادەنیشـین و باوکم دەڵێ: ((من چیدیکە ناتوانم کار بکەم و پارەو پۆلێك پەیدا بکەم. دەبێ بچـینە

تاران لە تاران دەتوانم بە تارەکەم کارێك بکەم و پارەیەکتان بۆ پەیدا بکەم ، دەنا من و ئێوەش لە برساندا دەمرین. شتێکیشمان نییە بیفرۆشین. لەم شارەش شەرمم بە خۆیە و ناتوانم کارێکی دیکە بکەم ، بابم و دایکم و داپیرە دادەنیشین سەر لەبیر کردنەوە دەنێن. داپیرە و دایکم بووکەشووشەیەکی گەورەو جوان بە پارچەی جوان و زەنگولەو موورووی جۆراوجۆر دروست دەکەن ، داوێك لە بووکە شووشەکە دەخەن و سەرەکەی دیکەی لە دەستی بابم دەخەن. باوکم کە تار دەژەنێ بووکەشووشەکە سەما دەکا. بووکە شووشەکە لەسەر پایەیێك دادەنێین و دەیدەنە دەستی من ، باوکم ئاوازێك دەژەنێ و بووکەشووشەکە دووبارە دەکەوتەوە سەما. بووکەشووشەکە لە ناو بوخچەیەك و پاشدان و لەناو چانتایەك دادەنێین. کتێبەکانیشم هەر لەناو هەمان جانتا دەهاوێم. بەیانییەکی زوو جانتایەکەیان دامێ و دەستی باوکم گرت و تارەکەش لەناو تورەگەیەکەو دەیدەنە دەست باوکم و دەکەوینەرێ.

دایکم بە بابم دەڵێ: ((وابکە ئەم منداڵە بخوێنێ و کوێرەوەر نەبێ. توبی ئەو خودایە ڕێگای خوێندنی لێمەگرە. لێشی مەدە زۆر عادزو دڵتەنگ دەبێ )) و ئینجا روو لەمن دەکا و دەڵێ: ((ئەم شیرەت لێ حەرام بێ ئەگەر دەرسەکانت بە باشی نەخوێنێ )).

دەستی دایکم و نەنکم ماچ دەکەم و دەڵێم: ((دایە گیان هەرچی چۆنێك بێ دەرسەکانم دەخوێنم دایە گیان خەم مەخۆ )).

دایکم بە بابم دەڵێ: ((لەو باوەڕەدای ئەو شکایەتەی لە قاسمە کوێر کرد ئەنجامێکی هەبێ و تاوانی کوێر بوونی چاوەکانت و شتێکمان بدەنێ خوێنی عیساش بە دایکی بدەن ؟ ))

بابم گوتی ئەگەر بیدایە تا ئێستا دابووی. بەڵام ئەو ناپیاوە هەر سەرێکیشی لێنەدام و لێی نەپرسیم. بیستوومە کە نەچۆتە سەر گۆڕەکەی عیساش )).

دەگەینە تاران. هەموو جێگایەك هەر ڕووناك و چراخانە. هەر تابلوی ڕەنگاو ڕەنگە و هەڵواسراوە. تەلار و باڵەخانەی گەورە گەورەو نوێ. مەخابن کە باوکم

کوێره. که له ئۆتۆمبێل دادەبەزین ئەوەندە قەرەباڵغە کە من دەستە پاچە دەبم. پێیم له بەردی ناوەڕاستی گەراجەکە هەڵدەزەڵێ و خراپ بەسەردا دەکەوم. هەر باشە کە باوکم ناکەوێ ، جانتاکە هەڵدەگرم و بەرەو ئوتێلێك دەچین بە دوای ڕێختەگەرێکدا (*) دەگەڕێین کە باوکم دەیناسێ و وا ڕێکدەکەون کە شەوان لەناو دوکانەکەیاندا بنوین. برادەردەکەی باوکم پیاوی چاکە ژن و چەند منداڵێکی هەیە ناتوانێ بمانباتەوە ماڵ. چونکە هەموویان لەناو ژوورێکدا دەنوون. پیاوەکە ناوی من لە قوتابخانەیەکی شەوانە دەنووسێ.

بەڕۆژ لەگەڵ ئاوازەکانی باوکم ئەم شەقام و ئەو شەقام دەکەین. لەو هەموو ئۆتۆمبێلە سەرم گێژدەخوا. خەڵکی بە پەلە پەل بەرێگادا دەڕۆن و ناوە ناوەێك پارەیەك دەدەنە باوکم. هەندێکیان هەر رادەکەن و گوێ بە ئاوازەکانی بابم نادەن. بابم چاوێلکەیەکی ڕەش دەکرێ. چونکە چاوەکانی زۆر ناجۆرن. پێڵووەکانی سووتاون و رەنگێکی زۆر سەیریان هەیە. ناو قەپێڵکەی چاوی لە باتی چاو پارچە گۆشتێکی هەڵئاوساوە. چاوێلکە کە لەچاو دەکا و هەندێ سەرو سەکوتی رێك دەبێ. دەستە چلکن و پیسەکەی دەگرم و برینەکانی کە خەریکن چاکدەبنەوە ، بە باشی هەستپێ دەکەم لە گۆشەیێکی خەیابانەکە دادەنیشین و ئەو شیعری کوردی دەخوێنێتەوەو ساز دەژەنێ. هەموو شیعرەکانی بە یادی ڕۆژانی کرماشانە. بە یادی دایکم و بە یادی ژینی رابردوون بە یادی رۆژانی جەوانی.

هەتا جحێڵ بووم فرەپیر نەبووم
دەمکرد راوی باز سۆنەگیر نەبووم
ئێستا کە پیرم من دەگرم سۆنە
سۆنەش سڵ دەکا لە داوی کۆنە
یان بە یادی عیسا دەیگوت:
ڕێچکەی باریکی گۆڕستان بۆتە ڕێت
گۆڕی تاریك تنۆکیش بۆتە جێت

بابم تاری دەژەنی و گۆرانی دەگوت و بووکەشووشەکە سەمای دەکرد چاوەکانی وەك چاوەکانی نەنکمن. هەمان چاوی پڕ لە میهرەبانی و خۆشەویستین. موغازەکان پڕیان لە یاری منالانە. بەلاّم من بووکەشووشەکەی خۆمانم خۆشدەوێ. شەوان لە گۆشەیێکی ناو دوکان دەردی دلّمی بۆ هەلّدەڕێژم. هەوەك دەلّیی لە دەورو رۆخی دایە گەورەم دانیشتوم و چیرۆکم بۆ دەگێرێتەوەو بە دەستەزبرەکانی پشتم دەخورێنیێ رۆژان بووکەشووشە لەناو دەستمدا لەگەلّ ئاوازو گۆرانییەکانی باوکمدا سەما دەکاو بە نەغمە و ئاوازی سازەکەی خەمی ئێمە جادەو شەقامەکان پڕ دەکا.

* * *

رۆژێك حاجی فەیروز هاتە لامان و لەگەلّمان دادەنیشت. لەگەلّ باوکم دەبێتە برادەر. پێکەوە دەچینە دوکانێکی ریختەگەری و نانی ئێوارە پێکەوە دەخۆین. حاجی فەیرۆز دەفێکی ئالّقەداری هەیە و شیعر باش دەخوێنینەوە. بابم زۆری کەیف بەم شیعرانە دێ و لەبەر یان دەکا و بە گۆرانی دەیانلّێتەوە. دەچینە سەر جادە. خەلّکی بە جلوبەرگی جوان و بۆنوبەرامەی خۆشەوە بە لاماندا تێدەپەڕن.

کوڕو کالّ و مندالّی وا بەلاماندا تێدەپەڕن کە حەزدەکەم دەستێ لە جلەکانیان بدەم. مندالّێکی چکۆلّە پارە لە دایکی وەردەگرێ و بەڕاکردن بەرەو لای دێ پارەکەم لەناو دەست دەنێ. دەستی زۆر چکۆلّە و سپی و جوانە ، باوکم تارەکە دەژەنێ و بووکەشووشەکە سەما دەکا و باوکم شیعرەکانی حاجی فەیرۆز دەچڕێ:

ئەی برالە گوێگرە لە باسی پڕغەمی ئەحوالّمان  
تابزانی بە کوێ گەییوە ئاهی سۆزانی سینەمان  
مورغ و ماسی ، خاویار و خامە و شیرو کەرە بۆ ئێوەبێ  
نان و دۆو شیرەو جەرگ و ناو با بۆ ئێمەبێ  
ئەم ئاوو هەوا فێنك و خۆشە با بۆ ئێوە بێ  
ئەم چەرە دووکەلّ و بۆ کزە ناخۆشە با بۆ ئێمەبێ  
باگولّ و لالەو دەرختی باغانیش بۆ ئێوە بێ

چال و چۆڵ و قوڕاوو خاکی خەیابان بۆ ئێمە بێ
شەونم و بۆنی شنە ، بەفری جوان بۆ ئێوە بێ
لافاوو سەرما و بەلاّ ، خانەوێران بۆ ئێمە بێ
ئای دڵی من          ئای حەبیبی من
ڕەنجی دنیایە          بوو بە بەختی من

لە جادەیەکی زۆر جوان رادەبوردیم و باوکم هەر دەیچڕی و سازی دەژەنی و بووکە شووشەش هەر سەما دەکا. لە پڕ کیژۆڵەیەك لە ئێمە نزیك دەبێتەوە. کەسێکی زەبەلاحی لەگەڵدایە و جانتای قوتابخانەی کچەکەی بە دەستەوەیە. کچۆلەکە دەوەستێ و لە بووکەشووشەکە دەنۆرێ کە سەما دەکا و لە پڕ دێتە بەردەمی من و دەستی بووکە شووشەکەم دەگرێ و دەیەوێ لەگەڵ خۆی بیبا. من بووکە شووشەکەی لە دەست دەستێنمەوە.

باوکم دەڵێ: (( چی بووە چی ڕوویداوە. کێیە لەوێ ))

دەڵێم: ((هیچ نییە بابە گیان کچۆڵەیەکە دەیەوێ بووکە شووشەکە ببا )). کچۆلەکە لە کوڕژنی گریان دەدا و بە جلوبەرگە رازاوەکانیەوە لەسەر زەویەکە لێی پان دەبێتەوەو دادەنیشێ و وڕك دەگرێ.

پیاوە زەبەلاحەکە دێتە پێشەوەو بەدەستە خڕو قەڵەوەکانی زللەیێك لەبن گوێی من دەدا. خەڵکمان لێکۆدەبێتەوەو پیاوەکەمان لە کۆڵ دەکەنەوەو لەگەڵ خۆیانی دەبەن.

دەستی باوکم رادەکێشم و لەوناوە دووردەکەوینەوە. باوکم ئیدی سەر و دڵی تەواو نییە. بەرەو دوکان دەبیتەوە. من لە دوورەوە پیاوەکە دەبینم کە بەدوای ئێمە دادێ. بە بابەم دەڵێم. کچۆڵەکەی لەگەڵدا نییە. من چیدی ئەو پیاوە نابینم و لەبەر چاوم ون دەبێ و هەناسەیەکی ئاسوودە هەڵدەکێشم. شەوان کە لە قوتابخانە دێمەوە وانەکانم دەنووسمەوەو لە تەنیشت بابم لێی رادەکێشم. خەودەمباتەوە. هەواکەی گەرمەو دەرگای دوکانمان لاونیو کردۆتەوە.

بەیانیەکەی هەڵدەستم بووکە شووشەکە لە جێگای خۆی نەماوە بابم هەڵدەستێنم و زۆری خەم بۆ دەخۆین. دەستی بابم دەگرم و دەچینەوە هەمان خەیابان. باوکم گۆرانییە خەماویەکانی دەخوێنێ و تاردەژەنێ بووکە شووشەکەمان بۆ پەیدا ناکرێتەوە.

یادی چاوە جوانەکانی بووکە شووشەکە ئاگرم لە دڵ و دەروونڈا دەکاتەوە ، وەك ئەوەی دایە گەورەم چاوەکانی خۆی لە بووکە شووشەکە خستبێ وابوو. جلەکانی بووکە شووشەکەم بۆنی کراسەکەی دایکمی لێدێ و شەوان بەو بۆنە ئاشناو خۆشەوە خەوم لێدەکەوت.

باوکم دەڵێ نامەیەك بۆ ماڵەوە بنووسە. دەنووسم کە بووکە شووشەکەیان لێ دزیوین، دەنووسم دایە گیان من لە قوتابخانە دەخوێنم و بەڵێن دەدەم کە باش بخوێنم و عاقڵبم و بووکە شووشە دزەکان عاقل بکەم و وەڵامی زللەکەیان بدەمەوەو تۆڵەی عیساش بکەمەوە. دەنووسم دایە گیان خەمی ئێمەت نەبێ و ئێمە باشین و زۆرتان بیر دەکەین. دەنووسم بووکەشووشەییێکی دیکەمان لە پارچەو مۆری دیکە بۆ دروست بکەن و کە ناسیاوێکهاتە تاران بە دەستی ئەو بۆمان رەوان بکەن. دەنووسم دایە گیان بابم ئێستا تاردەژەنێ و گۆرانی دەڵێ و منیش دەستی دەگرم و بووکە شووشەمان نەماوە سەما بکا. پارە بۆدایکم و داپیرم دەنێرین و گفتیان پێدەدەین کە بە زووترین کات سەریان لێبدەینەوە.

شەوان ئەو کتێبانە بۆ باوکم دەخوێنمەوە کە هاو پۆلەکانی لە قوتابخانەی شەوانە دەمدەنێ. سەیری بن ساپیتە دەکا و دەڵێ: ((ئای های کورێژگە شیرینەکەم ئەگەر ژیاننامەی من بنووسنەوە بە چەند کتێبان تەواو نابێ)).

من دەڵێم: بابە گیان من وانەکانم دەخوێنم و زۆریش کتێب دەخوێنمەوە تا ببم بە نووسەر و ژیانی تۆو دایە گەورەم بنووسمەوە.

بەسەر هاتی عیسا و دایکی بنووسمەوە. مەخابنە عیسا لە بیربچێتەوە. بەڵێ باوکە باش و شیرینەکەم. مامە کاهیش هیچ کەسێکی نییە و زۆری قسە بۆ کردوم.

من دەبم بە نووسەرو لە چەقۆی تیژی قاسمە کوێر و دارو دەستەکەیشی ناترسێم. بەڵێ بابە گیانەکەم.. بەڵێ )) رادەکشێم و لە کەلێنی دەرگاوە سەیری ئەستێران دەکەم و حەزدەکەم خەون بە بووکە شووشەکەوە ببینم.

**ڕیختەگەری: پیشەی قالبگەری و تواندنەوەی کانزاکان**

## لەگەڵ کۆخە کۆخی بابم

خوێنەر لە خوێندنەوەی ئەم چـیرۆکە رووبـەڕووی دیمـەنی پاڵـەوانی راسـتەقینەی چیرۆکەکە دەبێتەوە ، کە منداڵێکی دە دوانزە ساڵەیە و ئەویش لەناو واقیعێکی تاڵی وادایەکە بۆ کەسێکی لەو تەمەنە زۆر لەتوانا بـە دەرە. نووسـەر هەوڵیـداوە کـە لـە رێگای تایبەتیەوە هەستی پێبکاو بۆنی بکا و گوێی بۆ بگرێ. لـە راسـتیدا نووسـەر ویستویەتی هەستەکانی کەسی چیرۆکەکە. کە هەستی خودی ژیانی منـداڵی چـیرۆك خوانەکە بووە ، بداتە خوێنەر: ئەگەر چی لە هەندێ کاتدا وایدەر دەخا کە تـەنیا بـۆ کەسانێکی وەك تەمەنی خۆی نووسراوە.

خوا خوامە کە زووتر نیوەڕۆ دابێ. ماندوو دەبم ، گەرم دادێم. کوورە داغە و گڵپە گڵپی لێوە هەڵدەستێ. باوکم قالبەکان پر دەکا و باش دەیان پەستێتەوە تا توند و تۆڵ بن. عیسا قالبەکان لە ناوەڕاستی دوکاندا بەریز لە سەریەکدا دادەنێ. ئەوانەی سوور بوونەتەوە بە گیرەی گەورە لەناو کوورەکەدا دەردەهێنـێ. قالبـە سـوور بۆوەکـان لـە رەنگی رۆژ دەچن. نا توانم بەباشی تەماشای بکەم.

خوێنەر لە رێگای ئاواز و کەشوهەواو رەنگـی چـیرۆکەکە دەکەوێتـە بـەر رەوتـی رووداوەکانی بابەتی چیرۆکەکە و بۆی بە دەردەکەوێ کە هیچ شتێك لەبەر چـاوی ئـەو کەسەی چیرۆکەکە دەگێڕێتەوە، بزرنییە ، ئەمە بەو بەشە شەوە! بەو وردە شتانە شەوە کە بۆ چیرۆك گێڕەوە کـە نادیـارو نـەزانراوین. شـێوازی خسـتنەڕوو بـەرفراونکردنی چیرۆکەکە بۆ دیـد و هەسـت و جـۆش و خرۆشـەکانی منـداڵێتی چـیرۆك گێڕەوەکـە دەگەڕێتەوە. چیرۆك گێڕەوە خۆی پاڵەوانە کەیەو لەناو چـەقی رووداوەکاندایـە ، ئـەو

کاریگەریەکانی ئەو لە ئاوازێکی کە بۆ خستنەڕووی ئەو کاریگەریانە بەکاریدەهێنێ بە شوێن و پایەی کەسەکانی دیکەی چیرۆکەکە ئاشنا دەبێ. لە هەندێ کاتیشدا گێڕانەوەیەکی ڕاستەوخۆ و راپۆرتیانەیە ، وەك ئەو زانیاریانەی کە لە سەرقاسمە کوێ خاوەن کارگەکە دراوە. ئەم زانیاریانە کەمتر بە خاسیەتە نا مرۆڤایەتیەکانی قاسم پەیوەندی هەیە، زیاتر گشتی و سەر پێیین.

ئێمە هەمووومان بۆ کاك قاسم کاردەکەین. پێی دەڵێن قاسم چاوکاو، چونکە چاوێکی شین ومۆر بۆتەوە و ئەمەش نیشانەی لۆتیەتی و چەقۆکێشی ئەو بووە. زەمانێك شار قەرەباڵغ دەبێ و ئەو و چەند لاتێکی دیکە چەقۆ لە مامۆستا و نووسەرێك دەدەن. دوای ئەمەش دەوڵەمەند دەبێ و کاروباری زیاد دەکا. دوکانەکەی ئێمە هی ئەوە. ئەو دوو ئۆتۆمبیلی دیزل و ترێلەیەکیشی هەیە. قاوەخانەییێکی گەورە و قومار خانەیەکیشی هەیە.

وەك ئاماژە کراوە نووسەر لەسەر خاسیەتەکانی قاسم شتێك ناڵێ و کەسێتی ئەو وەك ((کەسێکی وەستاو )) تا کۆتایی چیرۆکەکە باسێکی دیکەی لێوە ناکا یان پەرە بە باسی ئەو نادا. دەکرێ کەسایەتی ئەو لەو چەند رستەی سەرەوە کورت بکرێتەوە. تەنیا ئەو کاتەی کە نووسەر لە کاتی کارکردندا ئەوەنیشان دەدا خوێنەوە دەتوانێ پەی بە سیفەتەکانی ئەو ببا بە تایبەتی کاتی تەقینەوەی کوورەکە. پاڵەوانی چیرۆکەکە و دایکی دێنە کارگەکە و قاسم دەبینن کە دەستەکانی لەبەر کەلەکەی ناوە و تەماشای کوورە ڕووخاوەکە دەکا و جوێنیان پێدەدا. هەروەها کاتێ کە لەگەڵ دایکیدا دەچنە بەر دەرگای ماڵەکەیان بە دەم جوین و قسەی ناشیرینەوە دەریان دەکا ، هەروەها ئاماژەکەی باوکی کە دەڵێ: (( کوڕە خۆ ئەونا مەردە هەتا سەرێکیشی لێم نەداو لێی نەپرسیم. بیستومە کە نە چۆتە سەر گۆڕی عیساش ))

لەزانیارییەکانی دیکەی باسمان کرد پتر کاریگەری لەسەر خوێنەردا هەیە بۆ ناسینی ئەو (قاسم) ە.

کەسە ناسەرەکییەکانی وەك عیسا و مامە کاهی ، هەر چەندە ئامادەییان لە ناو چیرۆکەکەدا زۆر نییەو. خاوەنی خاسیەتی کەسایەتییەکی تایبەت بە خۆیانن کە تەنیا پەیوەندی بە خۆیانەوە هەیە.

هەرچەندە ئەوان پلە و پایەیەکی لێکچوویان هەیە و چارەنووسیان کەم و زۆر وەك یەکە بەڵام لایەنی کەسێتی و ناسنامەی مرۆڤایەتیان کەم و زۆر لێکجیایە ، ئەمەش لە جۆری رەفتار و کاری رۆژانەیاندابە دەریدەخەن. عیسا لاوێکی شۆخ و دڵشادە لە کاتی کار کردندا ((گۆرانی عاشقانە )) دەڵێ و هەر کە دەستی بە تاڵ دەبێ بۆ سەر گەرمی و خۆشی پاڵەوانی چیرۆکەکە بە دەسماڵ مشك دروست دەکا. ئەو بۆ ئەوەی پارەی چنگ کەوێ و بتوانی ژن بێێ تەنیا نان و دووکەڵ دەخوا ، ((پار و بە دووکەڵی ناو دووکانەکە دادێنێ و دەیخوا )).

ئەو زانیایانەی کە نووسەر لە مەڕ عیساوە دەیدا شتی گشتی و سەر پێیی نین “ بەهەمان شێوەش مامە کاهی باسی لێوە دەکرێ. نووسەر باس لە مامە کاهی دەکا بەردەوام قسەیەکی ئەو کەسە بە کورتی دووبارە دەکاتەوە. مامە کاهی هەر چیەکی دەیبینێ دەڵێ: (( ئەمە یەك پووش ناهێنێ.)) هەر جارەی ئەم قسە بەبۆنەیەکەوە دەگوترێتەوە ، بە بێ ئەوەی کاریگەری ئەو قسە لەسەر خوێنەر کەم بێتەوە. دووبارە کردنەوەی ئەو رستە جۆرێك لە (کومیك ــــ کۆمێدی) دروست دەکا کە بەهۆی دووبارە بوونەوە بێتام و بۆ نابێ. وەك گوترا کە خوێنەر لە رێگای ئەم قسە و ئەو ئاوازەی لە گێڕانەوەی بەکار دەهێندرێ بە کەسایەتی مامە کاهی ئاشنا دەبێ: لە چیرۆکەکەشدا لە لایەنی کەسایەتییەوە زۆر زۆر باشە.

شوێنی پاڵەوانی چیرۆکەکە و باوکی، وەك کەسانی سەرەکی چیرۆکەکە ، لە بەشی سەرەتای چیرۆکەکەدا زێتر لە کەسەکانی دیکە سەرنجی خوێنەر دەخرۆشێنێ. پاڵەوانەکە شتێکی گرنگ لە بارەی خۆیەوە ناگێڕێتەوە. وەك کە باسکراوە خوێنەر لە رێگای کاریگەرێتی و خستنە روو باسکردنی ئەم کاریگەریانە لەگەڵ شوێنی کەسەکانی دیکەی ناو چیرۆکەکە و لەوانەش خۆی ئاشنا دەبێ. نووسەر دوای

تەقینەوەی کوورەکەو سڕینەوەی عیسا و مامە کـاهی لـە نـاو چـیرۆکەکە ، هەنـدێ وەسفی کەم و زۆر ورد لەسەر باوکی پاڵەوانەکە دەداتە دەست "

هەفتەی دوو جاران سـەری لێـدەدەین و سـاردەمەنی و جـاری واشـە سـێوی بـۆ دەکڕین. بابە سێوێکیان دەداتە من. لەسەرەخۆ قسەم لەگـەڵ دەکـا و دەڵـێ: ((ئـای کوڕە شیرینەکەم نارِحەت مەبە.))

من خەفەت دام دەگرێ و لـە کـورژنی گریـان دەدەم و وەك دایکـم لەسـەر سـەر چەفەوە پێەکانی بابم ماچ دەکەم. سـێوەکە لـەناو دەسـتم دا گـەرم دادێ. دڵـم نایـە سێوەکە بخۆم. کە دەگەمەوە ماڵێ ، نیوەی سێوەکە دەدەمە دایکم.))

نووسـەر هەوڵێـداوە تـا کۆتـایی بەشـی یەکـەمی چـیرۆکەکە ـــ کەسـەفەری پاڵەوانەکەیە لەگەڵ باوکم ــ هەوڵێداوە تا لەگـەڵ وێنـە گـرتن و بەرجەسـتە کردنـی ڕووداوەکان بە شێوەیەکی هەستپێکراو چیرۆکەکە بگێڕێتەوە. بەلاّم لە بەشی دووەمدا ، کە تێیدا شوێنی ڕووداوەکان ، مەبەست و شوێن و کاتی چیرۆکەکەیە ، دەگـۆڕێ ، ئەم کۆششە کەمتر بەر چاو دەکەوێ " لەبەر ئەوە کۆششی نووسەر تەنیا نمایشـکردنی ((تراژیدی)) مرۆڤەکان ــ پاڵەوان و باوکەکە ــ لە هەوڵی ژیاندا لـە هـەوڵی بـژێوی پەیدا کردندا ئاوڕی لێدراوەتەوە یان بۆ بژێوی پەیدا کردن گەڕێنراوەتەوە.

بە بێ ئەوەی وردەکـاری و ئاسـکردنەوە لـە نیگـار کردنـی چـەهرەی مرۆڤـەکان بدیترێ. پاڵەوان و باوکەکە بۆ هەلاّتن لە چارەنووسی غەمباری خۆیـان ـــ مـردن و برسیەتی ــ ڕێگای تاران دەگرنەبەر ، ڕۆژانە باوکی پاڵەوانەکە تار دەژەنێ و گـۆرانی کوردی دەڵێ و لەم شەقام بۆ ئەو شەقام دەچن. بەلاّم بە وونببوون ــ یـان دزینـی ـــ بووکە شووشەکەیان چیرۆکەکەیان دەگاتە ترۆپکی ، نووسەر یان بڵێن ئەوەی چیرۆکەکە دەگێڕێتەوە ــ بە دەربڕینێکی پڕ لە سۆز هەستەکانی خۆی لە نامەیەکدا دەخاتە ڕوو:

دەنووسم کە بووکە شووشەکەمانیان دزیوە ، دایە گیان من دەرسەکانم دەخوێنم و گفت دەدەم کە دەرسەکانم باش بخوێنم و ژیربم و ئەوانەی بووکە شووشـەکەمانیان دزی تەمێ بکەم و وەلاّمی زللەکەیان بدەمەوەو تۆڵەی مەرگی عیسا بکەمەوە.

له راستیدا ئەم نامەیە تووڕەیی نووسەرە لــە چــیرۆکی بێتوانــایی و بێدەســەلاتی کەسانێك کە نووسەر خۆی دروستی کردوە ، بە هەمان شێوە ئــەو شــیعرانەی بــاوکی پاڵەوانەکە بە گۆرانی دەیانڵێ ،

هەستی کەشوهەوای هەستە خەماویەکانی چیرۆکەکەی توندتر کردوە. پێــداگرتنی نووسەر لەسەر ناوەرۆکی مرۆڤ دۆستانەی پیرۆکەکە و پێدانی لایەنی ((بیرو باوەڕ)) بە هەست و بینینەکانی چیرۆك نووس ، بەشی دووەمــی کردۆتــە بەشــێکی تایبــەت لــە چیرۆکەکە و کە  بارێکی نەگونجاو لەگەڵ بەشی یەکەمی چیرۆکەکە دروست دەکا. وەك ئاماژەی بۆ کرا نووسەر هەندێ شتی گێڕاوەتەوە کە لەگەڵ خەیاڵی کوڕێژگەیەکی لەو تەمەنەدا نا گونجێ ـــ لــە راســتیدا ئەمانــەش لــە حــوکمی ئــەنجام و ((پــەیامی)) چیرۆکەکەیە کە نووسەر ــ لە دەرەوە بە کارەکەی خۆیەوە شەتەکی داوە. بە تایبــەتی بەشی دوایــی چــیرۆکەکە ، وەلاّمــی پاڵەوانەکــە بــۆ بــاوکی ، رەنگدانــەوەی راســتی چیرۆکەکە نییە بەڵکە رەنگدانەوەی بڕیاری نووسەرەکەیە " چونکە خوێنەر نازانێ کــە پاڵەوانەکە هوشیاری کۆمەلاّیەتی خۆی ــ ئەمەی کە نیازی ئەوەیە بیێتە نووسەر تــا ژیانی باب دایکی و نەنکی و دۆستانی باوکی خۆی بنووسێتەوە ـــ لە کوێ هێناوە.

حەیفە عیسا لە بیربکرێ. بەڵێ باوکە شیرینەکەم. مامە کا هیش هیچ کەســێکی نییە و زۆری قسە بۆ کردووم. من دەبمە نووســەر و لــە چــەقۆی تیــژی قاســم  و دارو دەستەکەشی نا ترسم.

کۆتایی چیرۆکەکە ، وەك کەباسکرا ، کاردانەوەی نووسەرە بەرانبەری ناکامیە زۆر تاڵەکانی کە بە ســەر کەســەکانی نــاو چــیرۆکەکەدا ســەپێنراوە ،  وادیــارە نووســەر نەیتوانیوە لەمەڕ چارەنووسێکەوە کە ســەر ئــەنجامی رژێمێکــی دژە مرۆڤــە ـــــ وە شوێن پەنجەی خودی نووسەریشی لە سەردا دەدیترێ ـــ خوێنساردو بێلایەن بمێنێتەوە ، ئەگەر چی پێگەی نووسەر بۆتــە هــۆی ئــەوەی چــیرۆکەکە نــەختێ رۆمانتیکیانــەو ناواقیعی خۆی بنوێنێ.

## بەفرینە

لەبەر بەرۆچکی بەر هەیوانێ دانیشتبوون و بەفرینە پاڵی بەسینگی دایکی دابوو. ژنەکە توند ئەوی لەنێوکۆشی خۆی گرتبوو. پرچە زەردەکەی بەفرینە، لە نێوان ددانەکانی شانەکەدا، نەرم وساف بەسەر پێستی شانوملیدا بلاْودەبۆوە. لەگەڵ هەر داهێنانێکی مووەکان، قەف قەف بەسەر یەکدا چین چین دەبوون.

((ئای! گوێم! گوێت لێکردمەوە!))

-چی بوو؟ دیارە گوێی تۆ کاغەزە. ئەگەر گوێی مرۆڤ بە شانەکردن لێدەبۆوە، ئێستا لەم دونیایەدا کەس گوێی نەدەبوو.

بەفرینە: توند دەستی بە گوێی خۆیدا هێنا. بە وردی تەماشای سەری پەنچەکانی خۆی کرد تا دڵنیا بێ لەوەی  کە گوێی بەخوێن داهاتوە یان نا.

دایکە بەگاڵتە گوتی:

((هەی هەی، هەی هەی.گوێت لێبۆتەوە و هەر ئاگاشت لێی نییە. دەبێ ئیمڕۆ بچمە کن مامە مەقدور و گوێچکۆڵە بزنێکت بۆ بکڕم.))

کوڕیژگەیەك لەسەر خاك و خۆڵی هەیوانەکە، ژێری خۆی تەڕ کردبوو و خەریك بوو بە ئەنگوستان گل و قوڕەکەی ژێر خۆی دەخوارد.

ژنەکە لە کوڕیژگەکە رووهات:

((ئەهای یوسفە.....کخ...کخ..هەی تف لە کارو کردارت! سەیری  سەیری چ ملچە ملچێکیەتی. دەڵێی پاقلاوەی گەرم و نەرم دەخوا هەی بەدبەخت.))

گلۆپێك لە لای کونە لوتێکی کوڕیژگەکە، هەر گەورە دەبوو و بچووك  دەبۆوە. یوسف بە قونەخشکە، خۆی گەیاندە دایکی. بەفرینە خۆی لەناو هەردوو ئەژنۆی

دایکی هێنــا دەرێ. ژنەکــە بــە لچــکێکی کراســەکەی کــەپوی منداڵەکــەی گــرت. ئەنگوستی لەدەمی منداڵەکە ناو گرمتە گلێکی لێدەرهێنا. گلۆپــە چــڵمیەکەی، بــە نەخشی بنە سوورگوڵەکەی سەر کراسەکەی ســڕییەوە و پەڵــەی چــڵمەکە بــەرە بــەرە بچووك بۆوە تا دیارنەمدا.

ژنەکە چووە ژوورێ.لە قوژبنێکی تاریکدا کۆنە چارۆگەیێکی هێناو لەســەر زەوی ڕاخست. چارۆگەکەی لە یوسف وەرپێچا. بەفرینە لەدایکە نزیك بــۆوە و پشــتی لــەو کردو ڕاوەستا. ژنەکە منداڵەکەی لە کۆڵێ بەست:

((ئەگەر زۆر وەڕس بوو بیکەوە. ئاگات لێیبــێ نەیخــەی! ئاگــات لــە مریشــك و جووجەڵاْن بێ. ئەنگوست بەکونە مار و مێروان دا نەکەی! شتی خراپ هەڵنەگریەوە. بیخۆی. بۆ فراوینت لە زەلاتەکەی دوێنی شەو نەختێ مــاوە، نیــوەڕۆ بــەنان بیخــۆ، نانی وشك و قەندم لەناو دەلاقــە دانــاوە. هــەرکاتێك یوســفە برســی بــوو، بیکوتــە، بیتلیسێنەوەو بیدەیە. مەهێڵە مێش و مەگەس لەدەم و لووتی بنیشن.))

هەربەدەم راسپاردەکانیەوە، تێشو بەرەکەی هەڵگرت. بــەرەو دیــوارە قوڕینەکــە چوو بەخۆی گوت:

((ئەمەدۆدانە[1] و ئەمەش تەورداس.))

ئەوانەی لە پای دیوارەکە هەڵگرت و لەبەر کەمەری بەستن. کلافێك گوریسی کە لەرۆخ سەکۆ کەوتبوو، هەڵگرت و بەکۆڵێ خۆی دادا. هێشتا پێیی لەســەر ســەکۆکە دانە نابوو کە بەفرینە بەتەکانێك یوسفی لە کۆڵێ خۆیدا جــێگیر گــرد. دەســتی بــە دامەنی داهێنا و نامەیەکی گەچراو وگرمۆڵە کراوی لە باخەڵی دەرهێنا. چەند دێرێك لە نامەکە کە لەبەردەست پێداهێنان سڕابوونەوە.نیشانی دایکی دا. گــەردەنی خــوار کردەوە و بە شەرمنی و پاڕانەوەێیەکەوە گوتی:

((دایە جارێکی دیکەشم بۆ دەخوێنیەوە؟))

---

١- دۆدانە: دێمکەی ئاو

ژنەکە گـەڕاوە. لێوەکـانی بەپێکـەنینێکی کـەم کرانـەوە. نامەکـەی لەکچـەکە وەرگرت.

لەچەهرە رەنگ بزڕکاوەکەی ئەو ڕاما:

((خەریکە درەنگم بەسەر دادێ. دوو رۆژە ئەم نامە گەیشتوە و هـەزارجارم بـۆت خوێندۆتەوە. بەخوا ماندو بووم.)). لە پڕ دڵی پێی سووتا. دەستێکی بەسەرو پرچـی بەفرینە داهێنا:

((ئیمڕۆ کچێکی باشبە هـەر چـییەکی پێـتم گـوت وابکـە تـا ئێـوارێ کـە لـە بێشەلانەکە هاتمەوە جارێکی دیکەشت بۆ بخوێنمەوە.))

بەفرینە سەری بە سکی دایکی کردو لە سەرەخۆ کراسەکەی ماچ کرد. نامەکەی لە باخەڵی هاویشتەوە. هەردوو دەستی لە پشتەوە توند بە ژێـر منداڵەکـەوە گـرت. منداڵەکە کە هەستی دەکرد دایکی دەیەوێ دوورکەوێتەوە لچ لێوی پێکدادا خۆی بە لای دایکیدا سوڕاند، بەلاّم بەفرینە چەند جارێك خۆی هەڵدا ئاسمان و منداڵەکـە کـە وتە پێکەنین، بەفرینە بەرەو خوارەوەی حەوشەکە رایکـرد و لەتەنیشـت کولانەکـەی جووچکە و مریشکان دانیشت. دایکە کە لەو دیوی کۆلانێوە گـوێی لـە تریقانـەوەی منداڵەکەی بوو و دڵی سوکنایی هات.

❊ ❊ ❊

ژنەکە گەیشتە دامێنی گردەکە. پەتی سەری دۆدانەکە، مەچـەکی ئـازار دەدا. پەتەکەی کردەوەو بەدەستەکەی دیکەوەی گـرت. شـوێنی گوریسـەکەی سـەر شـانی گۆڕی. چاوی لەو رێگا پێچاو پێچە بڕی کە لەسـەری گردەکـەوە بـەرەو خـوارێ پـان دەبۆوە. پیاوێك خەریکی خلۆر کردنەوەی بارێك دارو چیلکە بوو بەسەر ڕێگە پێچـاو پێچەکە کۆمەڵە چیلکە و دارەکە پیاوەکەی بەدوای خۆیدا رادەکێشا و لەسەر ڕێگـە پێچاو پێچەکەی دەبردە دەرێ. تۆزو خۆڵێکی زۆری لێهەڵدەستا و بۆ دەمێك کـابرای لەناودا بزردەبوو.

مامــــه مەقـــدوری شــــوانکارە. چـــەند هـــەنگاوێك لـــەولاتری مێگەلەکـــە، بەپیشەقانەکەی،رەگ و ریشەی گیاو گۆلێکی کە بۆ خواردن دەستیان دەدا، لەناو دڵی خاکدا دەردەکێشا و سترانێکی غەریبانەی دەچڕی:

((بەگاسنی غەم، شۆی زەوی خەمم بڕی.

بە بنە تۆوی غەم تۆم دا.

بەرهەمم غەم بوو. بەداسی خەفەت دووریمەوە.

دانی خەمم بردە ئاشی غەم.

ئاردی خەمم بە ئاوی خەفەت شێلا.

لەتەنووری خەم برژاندم.

نانی غەمم لەسەر خوانی خەم دانا.

هاو سفرەکەشم خەم بوو.

لە تەنیشتی دانیشتم و لەگەڵ خەم خواردم.))

-سەلام و عەلێکم مامە مەقدور!

پیرەمێردەکە کەمەری راستکردەوەو ملی سوڕاند:

((وەعەلێکم وسەلام، سەلیمە خان، دەنگ و باسی حەمە چییە!))

-دوو سێ رۆژێك پێش ئێستا نامەی هاتووە، نووسـیویەتی کـە چـەند رۆژێکـی دیکە مرەخەسی وەردەگرێ و دێتەوە ئیشا ئەڵڵا.

-لەپەنای خوادابێ. بەخێرو سەلامەت بێتەوە ئیشا ئەڵڵاٌ.

-سەلامەت بی. خوا هەر عەمرتان لە نوێ بنووسێتەوە.

سەلیمە گەیشتەدار بەڕووەکەی بنار تەپۆلکەکە. قەلەڕەشـکێك لەسـەر دارەکـە نیشتەوە و سێ جاران قڕە قڕی کرد. سەلیمە بە قەلەڕەشکەکەی گوت:

((خەبەرت خێربێ.... خوا خێرانکا...خەبەرت خێربێ.))

ئەنگوستی شادەی وەك قولابێك لێکرد و ئارەقەی برۆیـەکانی پێسـڕیەوە پشـتی چەماندەوە و هەنگاوی بۆ سەر ڕێگا پێچاو پێچەکە هەڵهێنا.

لەنیوەی ڕێگادا گەیشتە ئەو پیاوەی بارە چیلکەکەی خلۆر دەکردەوە خواریٚ، هاوسێکەی ناسیەوە:

((ماندو نەبی خالۆ مەولوود))

-ئای سەلامەت بی کچی خۆم. چەندە ناوەخت هاتوی! بەدرەنگ کەوتووی!

سەلیمە هەناسەیەکی تازەیدا:

((ژنی خاوەن مندالٚ نیوەی هی خۆی نییە خالۆ. تا لە بێنە و بەرەی مندالاٚن بوومەوە، نیوەڕۆ داهات.))

پیاوەکە گوتی:((باشیەکەی لەوە دایە کە لە ڕۆژانی بەهاران، هەرکەسە بەمرادی خۆی دەگا. ئەوندەی بتەویٚ ڕۆژگار درێژە.))

ئاماژەییێکی بۆ جێگایەکی دووری سەری گردەکە کرد:

((ئاگات لە بێشەلاٚن بیٚ، گیاندار و دڕندە لە ترسی هاڕە هاڕی مێگ و میراژان لە پڕ و لەنکاو ورووژم دەهێنن.))

-ئاگام لەخۆیە خالۆ. مرۆڤی سەلٚت، پالەوانی خوایە. من خۆم لەوان کەمتر نیم.

بەهار، تارای سەوزی بەسەر ئەو ناوە دادا بوو. شنەی با بۆنوبەرامەی تالٚی گولە بادەمی کێوی دەهێنا.سەلیمە ماندو بوو. داسەکەی بەچەپ و راستی چلە دارەکاندا دەدا و ئارەقەی دەردەدا. دەمو چاوی وەك گولٚ گەشابۆوە وەك نانێکی جوان و ناسك بوو. وەختێکی تەواوێك لە عەسر تێپەڕیبوو. پالٚی بەکۆلکە دارێك دا. ویستی گرێی دۆدانەکە بکاتەوە کە هاڕەیەك بێشەلاٚنەکەی لەرزاند. چەند گلۆکەیەکی بادەمی کێوی هەلٚوەری ورووژانە سەر زەوی. سەلیمە بە شێواویە لەجێی خۆی ڕاپەڕی. سیٚ فرۆکە لەپەڕەگەی ئاسماندا بوون. لەودیوی گردەکە ڕمبەو هوڕ بەرز بۆوە. بایێکی فێنك ئارام و لەسەرەخۆ، تەپ و تۆزەکەی روونـاك دەکرکردەوەو بەرەو گوندەکەی کە لەو دامە نانەی خوارەوە بوو و خامۆش و درێژوکە هەلٚکەوتبوو دەهێنا.

سەلیمە لەسەرەخۆ دەنوزاوە: ((سوپاس بۆخوا، زۆر لەئێمە دوورە.)) لەگەڵ زرم و هۆڕی چەند بۆمبێکی دیکە، چوێلەکەکان، بەقاو و قیژو جریوە جریوێکی سەیرو سەمەرەوە دوور کەوتنەوە و ئەو ناوە هەمووی کپ و بێدەنگ بوو. چلێك بەقەدی دارەوە بەکێش دەهات و دەنگێکی وەك خوراندنی لەش بە نیکۆکان دەهاتە بەر گوێ، بۆنێکی ناخۆش و نا ئاشنا، جێگای بۆنی تاڵی گوڵوکە بادەمانی دەگرتەوە. سەلیمە هەستی بە کڕانەوەی قورگی کرد. کۆخەییێکی کردو رەپێ بوو و بەدڵێکی پڕ لە خورپە و ترسەوە، بارە دارو چیلکەکەی بردە سەر رێگا پێچاو پێچەکە.

* * *

هەتاو لەو دەشت و دەرانە ئاوا دەبوو. رەنگی دێیەکە، لەبەر سێبەری تەپۆلکەکە، وەنەوشەیی خۆی دەنواند. سەلیمە کلکەی گوریسەکەی توند وتۆڵ لەدەستی خۆی پێچا بوو و لەسەرەخۆ، ئارەقەی دەردەکردو بارەکەی خلۆر دەکردەوەو گوریسەکەی بۆشل دەکردەوە تا رکێفی بارە چیلکەکەی بگرێ و نەوەکا بارەکە بخزێ و لەگەڵ خۆی هەڵیدرێنێ. هەرکە گەیشتە دواپێچی گردەکە، هەناسەی سواربوو. بۆنوبەرامەی گۆرین هێشتا هەردەهات.ناوە ناوە بۆنەکە کەسکونتر دەهاتە بەر لووت و هەندێ جاریش لەگەڵ هەڵکردنی شنەی با هێور دەبۆوە. سەلیمە دانیشت و بارەکەی بەهەوڵ و تەقەلا بەکۆڵی خۆی دادا. ناولەپی دەستەکانی دەچوزانەوە گەیشتە بن دار بەرووەکە. قەلەڕەشکەیەك کەوتبووە سەر پشت و قاچەکانی لەحەواکردبوو.مامە مەقدور بێ هەست و خوست پاڵی بەدرەختێك دابوو و ژنەکە لێیی تێکچوو کە وەك هەمیشە مامە مەقدور پێی بڵێ:

((ماندوو نەبی، بەخێربێی!))

بۆیە ژنە بەماندوویی هەناسەیەکی قووڵی کێشا و وەك هەمیشە وەڵامی داوە:

((سەلامەت بی مامۆ.))

بەدوو دڵیەوە تەماشاییێکی لای مامە مەقدوری کرد، مامە سەری بە ئەژنۆ یەکانی کردبوو. پیشە قاناکەی هەرلە باوەشێ بوو و دەستەکانی شۆڕ ببوونەوە

خوارێ. ڕەگ و پیگە جواوەکەی نـاو دەمــی لەبــەر پێیــەکانی  تفانـدبۆوە. ژنـە وای تێگەیی کە مامە خەریکی  بەســتنی  بەنـدو داوەکـانی  کەوشـەکانی  بـێ. ئینجـا کۆخەیەکی بۆ  کرد  و  بەدەنگێکی  بەرزەوە گوتی:

((مامە! تۆ هەموو کات هەر ســەرت لــە خــەو نـاوە. خەریکـە خـۆر ئـاوادەبێ کەنگینێ مێگەلەکەت بەرەو ئاوایی بەرەو  ئاوایی دەکەیەوە.))

مامە هەر جوولەی نەکرد. ژنە لە مێگەلەکـە ڕامـا، ســەریان بەپشــتی یەکـدی کردبوو و بێ هەست و خوست بوون و دەنگیان لەبەرەوە نەدەهات.

کاوێژیان نەدەکرد. سەگی مێگەل، ملی لەسەر فێنکایی زەویەکە درێژکرد بوو.

شنەیەك هەڵیکرد بوو. بۆنەکە بەرە بەرە کــەمتر دەبــۆوە، بــەڵام قــورگی ژنەکـە هەردەزوراوە. بەدڵەڕاوکە و نیگەرانییــەکی نادیــارەوە گوریســەکەی  شـل کـردەوە و بەڕەڵای کرد. بارەکە کەوتە سەر زەوی. بەرەو کــن مــامۆ چـو. مــەلێك لــە دوورەوە خوێندی و قڕاندی:

((ووی وەی...... ووی وەی.....ووی ووی))

ترس و دڵەخورپێ سەلیمەی داگـرت: بــەڵام بــەرەو پێشــەوە چــوو. بەدوودڵیــەوە دەستێکی لەسەر شانی مامە دانا: ((مامە بۆچی))

مامە کەلا کەوت و چاوە زەقەکانی لە ئاسمان بڕی.

سەلیمە چریکاندی و لەمامە دوورکەوتەوە. پێی لە مەڕێك هەرلژەلی و لە پاوڕوو بەسەر مەڕێکی دیکە داکەوت. بەچریکە چریکەوە راستبۆوە.. سەگی مێگەلەکە لــە جێی خۆی وشك ببۆوە. سەلیمە سینگ و بەرۆکی خۆی کوتا. سەر پێچەکەی لەســەر سەرکەوتە خوارێ و قژوبسکی خۆی رنیەوەو کەوتە ڕنینەوەی دەموچاوی و بەئــەژنۆی شکاو و بێهەست رایکردە ماڵەوە، لە قەراغ گوندی بەیەکەمین مــاڵی دێیەکـە.ماڵی مام موولوود گەیشت.هێشتا بارەکەی هەر لەپەنا دیواری حەوشە دابوو پورێ کەمێك بــەلا داهــاتبوو پــاڵی بــەدیواری ماڵەکــەیان دابوو،کلاشــەکەی نــەنیوە ناچــلی بەدەستەوەبوو. تۆپەڵە دەزوەکەی بۆ خوارێ خل ببۆوە. سەری دەزوەکەی لە نێو ددانان

دابوو و بەگۆشەییێکی لێویەوە ئاوێزان ببوو. سەلیمە چنگی لە چڕچاوی خۆی گیر کرد. هەر هەمووی داڕوشا. یەك بەخۆی بانگ و هاواریکرد:

((پووریێ.....پووریێ چ دەردو بەلاٌیەکمان بەسەرداهاتووە؟!))

پوریێ بەچاوە لەقەپێلك دەر پەڕیوەکانی چاوی لە دیوارەکە بڕی بوو. بۆنی تایین لەگەڵ بایەکە کەم و زۆر دەبوو، ژنە بە کۆخە کۆخ دەرگا دارینەکەی حەوشەکەیانی کە دەرك بەدەرکیماڵی مام مەولوودیەوە بوو بە لەقەیەك خستە سەر گازەرای پشتی:

((بە فرینە.....ئەهای بەفرینە! ئازیزەکەم لەکوێی ؟!))

بە چەند هەنگاوێکی گەورە خۆی گەیاندە کولانەی مریشکان:

((بەفرینە خانمەکەم، یوسفە ناسکۆلەکەم، نووستوون!. دەك بەڕاگیڕتانبم ئازیزەکانم. نیوەڕۆ شتێکتان خواردوە یان نا!))

بەفرینە وەك دایکێکی میهرەبان یوسفی لەسەر بازووە وەك دار قەننەکەی خۆی خەواندبوو. جووجەڵەکان لەم لاو لەو ئەو لای مریشکەکە هەناسە لەبەر بڕاو و بێ جووڵە لێی کەتبوون. مریشکە بێ جووڵە سەری بۆ ژێر باڵی بردبۆوە.

ژنەکە دەستە چکۆڵەکانی کچۆڵەکەی راتەکاند تا وەئاگای بێنێتەوە. نامەکە، لەنێوان یوسف و بەفرینەدا، لەسەرەخۆ دەجوولاٌوە. چەند دێرە سڕاوەکەی زێتر سڕابۆوە: ((لە دوورەوە کچە نازەنینەکەم ماچ دەکەم و لە چەناگە جوان و فندقیەکەی گازدەگرم. تاچەند رۆژێکی دیکە روخسەت لەخاوەن کارەکەم وەردەگرم و......))

مێرووولەیەکی مردو لەسەر چەناگەی بەفرینەدا بە وردە نانێکەوە نووسابوو.

# کەڵەقەمیش[1]

کوڕێژگەکە دەمی چەقۆکەی لە کەلە قامیشە درێژەکـە نـاو دەسـکی چـەقۆکەی فشاردا. چەقۆکە هێشتا لەقەدی کەلە قامیشـەکە دابـوو کـە برووسـکەیەك لەسـەر چەقۆکەدا تیشـکی داوە و شـەوقەکەی لەچـاوی کوڕێژگەکـەی دا. هـەورە تریشـقە گرماندی. لەپڕ ڕێژنەییێکی بەخوڕ بەسەر قامیشەلأنەکەدا باری و سـەر رووی سـافی گومیلکەکەی وەك دەموچاوی ئاوڵەداران کون کون کـرد، بـا لـەناو قامیشـەلأنەکە تێیهەڵکرد بوو، دەنگی خشە خشی قامیشەکان ئـەو نـاوەی پـڕ کردبـوو. مریشـکە ئاویەکان بەرەو قامیشەلأنەکە دەرپەڕین. هەرە بچووکەکەیان بنـاوێکی لێـداو ئیـدی لەسەر ئاوەکە بەدەر نەکەوتەوە. بارانەکـە سـاردبوو و رووی گۆمەکـەی کـون کـون دەکرد. تەمەکە دادەهات و دەوروبەرەکە لەناو تەم و رێژنەی باراندا، شـێلو دەبـوو و تاریك دادەهات.کوڕێژگەکە کەلەقامیشەکانی بۆ پارچە پارچەی کـورتر بـڕی. کـونی یەکێك لە قامیشەکانی لەسەر چاوی راستی داناو لە کونەکـەوە تەماشـای ئەوبـەری گۆمەکـەی کـرد. لەبازنـەی تـەماوی کونەکەوە،چـەند ئوتـومبیلێکی لـەو بـەری قامیشەلأنەکەوە[2]دیت. سێ جێبی خاکی لەوێدا وەستا بـوون وکەسـانێك بـە پـاڵتۆی بارانی رەشەوە، دادەبـەزین.کلأوە بارانییـەکانیان، سـەریانی داپۆشـی بـوو و تـەم و بارانەکە نەیاندەهێشت دەموچاویان بدیترێ. کوڕێژگەکە بەدڵە خورپەوە، بەلأم سـووك وەك پەڵە هەورێك نەختێ چووە پێشـەوە بـەدوو چـاوی حەیرانـەوە لەکـەلێنی نێـوان

---

١- کەلەقەمیش:لێرە مەبەست ئەو کەڵە قامیشـەیە کـە نوکەکـەی باریـك دەکرێ.بـۆ نوسـین بـە کاردەهێنرێ،بەتایبەتی خۆشنووسی.

٢- نەیزار:قامیشەلأن.

قامیشەڵانەکەوە خەریکی تەماشاکردنیان بوو. ڕەشپۆشەکان، بەدەم و چاوێکی خەت خەت بووی بەر چۆڕاوگەی باران، هەشت کەسیان لەجێبەکان دابەزاند. چاوەکانیان بە پارچەی سپی بەستبوونەوە لەپشت ریژنەکەوە، کەوەك کوندەی سەر بەرەو ژوور دەباری، بەپەلە هەموویان لەتەنیشت یەکەوە ریزکرد. دەستی راستی یەکەم کەس بە باندی برین پێچرابوو و خوێن لەژێر باندەکەوە دەچکاوە، جۆری باندەکە لەهەمان جۆرە باند بوو کە دەموچاوی پێی پێچرابۆوە. مووی سمێڵە زەردو خاوەکەی لەگەڵ تەوژمی بادا دەبزوتن تێکدە ئالاَن و لەهەردوولاوە ئاویان لێدە چۆڕاوە. ڕەشپۆشەکان بە پەلە پەل لە هات و چۆ دابوون و دامەنی بارانییە درێژەکانیان لە پێیەکانیان دەهالاَ.

کوڕیژگەکە، سەراپای ئاوی بارانی لێدەچۆڕاوە،زەل[1] و قامیشەکانی لەناو دەستیدا دەگوشی. بەبێ جووڵە کورکەی[2]لە خۆی بڕیبوو و لەوبەری گۆمەکە رامابوو. ناوە ناوێك لەرزێك سەراپای گیانی دادەگرت و دادەچڵەکی. باران داو داو و پشك پشك، ئاسمانی دەبڕی و تەم لەنێوان تنۆك و پڕیشکەکانیدا دەخزی. ڕەشپۆشەکان، تفەنگەکانیان لە ژێر بارانیەکانیاندا دەرهێنا و ئەژنۆ یان دادا. هەموو جێگایەك خوسابۆوەو گۆمەکە بەرە بەرە پڕ ئاوتر دەبوو. یەکێك لەوان، لەبەر باغە کاغەزێکی هێنا هێنا دەرێ و بەزمانێك کە کوڕەکە هیچی تێنەگەیشت، خوێندیەوە. بەدەنگی بەرز و خراپیەکەوە خوێندیەوە. کاغەزەکە خوساوە، بەدەستی کابراوە چەسپا.

کابرا بە زەحمەتێکەوە کاغەزەکەی لەدەستی خۆی کردەوە و پارچە پارچە فڕێیدا سەر زەوی،بەڵاَم پارچەیێکی بە بارانیەکەیەوە نوساو هەر بەویۆەش ماوە. لەگەڵ هێنانەوەی میلی تفەنگەکان بارانەکە لەرزیەوە، مریشکە ئاوییەکان لە پاڵ قامیشەڵانەکە ونبوون. کەسی یەکەم کەدەستی باند پێچ کرابوو، لە جێگای خۆی تەکانێکی دا.مستە قوچاوەکانی گوشی، پاڵە پەستۆی زەبری گوللەکان، زەلامی سێیەم و چوارەمی، کە نەوجەوان و لاواز و بەلە باریکە بوون، چەند قولانجێك فڕێدا

---

١- زەل:قامیش

٢- کورکە: هەست

ئاسمان. لەدوورەوە شریخەیەك هات و باران بەگوڕتر دایكرد. مریشكە ئاویەكی ترساو و شێواو بەبەر پێی كوڕیژگەكە بەخێرایی ڕایكردو سەری خۆی لە نێو لاسك و گەڵای قامیشەڵانەكەی دامێنیٚ ڕاكرد، بەڵام كلك و پێیە زەردە پەردەدارەكانی، لەدەریٚ مانەوە. هەڵلەرزینی پەردەی مەچەكی پەلەوەرە ئاویەكە، كوڕیژگەكەی پتر ترساند.

دوای ڕێژنە بارانی گوللەكان ئەو ناوە كپ و بیدەنگ بوو. بەسەر لێشێواویەوە، بەزەحمەت لە نێو پووش و پەڵاش وكەڵەقامیشەكان هاتەدەر. بەڵام لەگەڵ تەقەی ئەو گوللانەی كە، تاك تاك دەتەقێنران.لە جێگەیێك بەبیٚ جووڵە خۆی مات كرد. سەرە چكۆڵە و ڕەنگ ما هوتیەكەی، لەگەڵ هەر تەقەكەیدا دەسوڕاند و دەجووڵاندەوە. پشتە كوڵكنەكەی كەتنۆكی بارانی بەسەردا دەخزی و بە هەشتا و خۆی لەناو ئاوەكە كردەوە.

باران وەستاو تەمەكە ڕەویەوە.كوڕیژگەكە هاتەوە سەر خۆی. كەنەفت و واق و ڕماو، هەستی كرد كە حەز لەهەتاوێكی گەرم دەكا. وەك هەموو ڕۆژێك چاوەڕیٚ بوو كە هاوسێیەكەیان خاڵە سیاوەحش بۆ زەل بڕین بێتە ئەو ناوە. خەریك بوو دەموچاوە تەڕو خوساوەكەی بە سەر دەست و لچكی چاكەتەكەی وشك دەكردەوە لەوكاتەدا دەنگی خاڵۆسیاوەحشی لە دوورەوە هاتە بەر گویٚ.

((هۆ هۆی...هۆ...هۆ...هۆ!))

كوڕیژگەكە دەنگی دەلەرزی، بەسەر لێشێواوی و لالیٚیەكەوە وەڵامی داوە:

((هێیٚ ی هیٚ....هیٚ...هیٚ...!))

دەمێك دواتر خاڵۆ سیاوەحش لە نێوان قامیشەڵانەكەدا بەدەركەوت. لە بەردەمی قیت بۆوەو جامانە تەڕكەی كردەوە تا بیگوشیٚ.

((چ لافاوێكە! چ ڕۆژێكی ناخۆشە! نازانم بۆ هاتیین.))

كوڕیژگەكە، چاوە پڕ لەسەر سامی و تیٚڕامانەكانی لەگۆمەكە بڕی.

((زۆر لەپڕتاوهاتن. لەگەڵ ڕێژنەكە ئا لەویٚ....))

-ئیستا بەسەرچوو، تازە هاتووین! هاتوین! واباشترە دەست بەكارەكەمان بكەین.

کۆخەیەکی کرد و بەرەو نەیزارەکە چوو. پێڵاوە لاستیکییەکەی کە لە سەرِ قورِو لیتە و پووش و پەلاشی قامیشەلانەکە دەخزی:

((بەر لەهەموو شتێك دەبێ ئاگرێك بکەینەوە))

زۆر هەولیاندا تا ئاگرێکیان کردەوە. لە رۆخی دانیشتن و هەلم لە جلوبەرگەکانیان بەرز بۆوە. خالۆ چەقۆیەکەی نوشتاندەوە گوتی:

((لەوێ، لەپشت قامیشەلانەکە..))

خالۆ لەدەموچاوی کورِەکە راما.

((بۆچی رەنگت زەرد بووە، وەك زەردە چەوە لێهاتووە وەرە نیشانم بدە، چی روویداوە براکەم؟))

هەرکە گەیشتنە ئەو شوێنەی کە گورِیژگەکە نیشانی دابوو، جۆگەیەك لەچۆرِاوکەی خوێن و باران، لەژێر پێیەکانیاندا چۆرِاوگەی بەستبو. خالۆ داهاتەوە:

((دەنگی تەقە هات...بەرِێژنە! پەلەوەرەکان زۆر ترسان، ئەوان....))

-لەکێویەکانیان دا.گەلەیەکی زۆر بوون!

کورِیژگەکە هەرمات بوو.

((هەشت دانەبوون.))

-کێ

- کێوییەکان! هەبێ و نەبێ خەونم دیتوە.

چاوەکانی خۆی هەلپشا فت:

((بەجۆرێك قسەی دەکرد کە هیچی تێنەدەگەیشتم.))

خالۆ لەسەر زەویەکە دانیشت و بەدەستەکانی قورِەکەی تێك هەلپشاوت:

((ئەوانە، شوون پێی مرۆڤن. زۆر بوون. شونپێی کێوییەکانیان هەلگرتووەو وێرانیان کردون.))

بە ئەنگوستی شادەی، شتێکی سپی لۆکەیی نەرمی وەك گەچ لە نێو جۆگا خوێناویەکە هەلگرتەوە:

((بەکەللەی سەریانەوە ناون. لەنزیکیشەوە پێوەیان ناون!))
کەمێك بیری کردەوە و بە قامیشەلاٌنەکەیدا هەلٌڕوانی تێیڕاما:
((لە ناغافل گرتویانن.))
کوڕیژگەکە گوتی: ((دەبێ وابێ))
هەردووکیان بۆ قامیشەلاٌنەکە بۆ رۆخ ئاگرەکە کە ئیدی خەریك بوو گڕی دادەمرکاوە، گەڕانەوە. خالۆ دەستی بەدوزەلە لێدان کرد وکوڕیژگەکەش کە سەرو بنی زەلەکانی بڕی بوو. دەستە دەستە رێکی خستن و لەکیسەی کردن. خالۆ یەکێك لەکەلە زەلەکانی دەست دایە و بەوردی تێڕوانینی.
((ببینە! پشکە خوێن پڕژاوەتە قامیشەکانیش.))
کوڕیژگەکە، قامیش و زەڵەکانی لەناو دەستیدا سوڕاند:
((نەنکم دەیگوت هەر کاتێ هەورە برووسکە لەنەیزاران بشریخێنێ، قامیشەکان پڕ دەبن لە پەڵەی خوێن.))
-راستی گوتوە، منیش بیستومە.
پاشکۆیەکی سوورو بچووکی هەڵگرتەوە.لەسەرخۆ فووی لێکرد تا گڕی گرت و لە مەودای دیاریکراو رووی سافی قامیشەکانی سووتاند و لە یەك ریز کونی کردن. دوودانە زەڵی کونکراوی لە تەنیشت یەکدا داناو بە دەزوێکی مواوی. تونددو تۆڵ بەستنی. دوایی دوو دانەی کورتیلە و باریکتری بە چەقۆ قڵیشاند و لەدەمی زەلە کونکراوەکانی راکردو بەهێمنی گوتی:
((بوو بە دووزەلەیەکی باش.))
دەستەکانی لەسەرئاگر گەرمکردەوە.جامانەکەی کەهێشتا نیمی مابوو، لەسەری پێچاوەو دووزەلەکەی بە لێوەکانیەندا دووزەلە نالەی لێوە هەڵسا لەپڕ گۆمیلکە و نەیزار و جیهان، بێدەنگ بوون تا دەنگەکە بە هەموو شوێنێك بگا:
((نەی بژەن نەی بژەن نەی بژەن))
-چ خۆشی دەژەنی نەی ژەن

-بژەنە نەی لە کێو و لە بازاران

-کەمنیان کوشت لەداوێنی نیزاران.

ئینجا دووزەلەکەی بەوردی تەماشاکرد و سەرو بەریکرد و دووبارە خستیەوە نێوان لێوەکانیەوە

((بژەن نەی ژەن بژەن نەی ژەن بژەن نەیژەن))

چ خۆشی دەژەنی نەیژەن

بژەنە نەی لە کێوان، لە بازاران

کەمنیان کوشت لە دامێنی نەیزاران

خالۆ یەکسەر دووزەلەکەی لە باخەڵیدا شاردەوە:

((بەڵێ. ڕاستە، کەسێك لە دوور لەگەڵ دووزەلەکەی من گۆرانی دەڵێ. چەندە پڕلەخەم گۆرانییەکە دەڵێ))

* * *

بۆ ڕۆژی دوایی کوڕیژگەکە زەلەکانی بۆ ماڵی مامۆستاکەی برد و لەبەردەمی دانا.

مامۆستاکە تەماشاییێکی چاوە سوور داگەڕاوە و تادارەکەی کوڕەکەی کردو دەستە تەڕ و تازەو ناسکەکەی لەناو دەستەکانی خۆیدا گرت:

((تات لێیە کوڕەکەم! دەستەکانت ئاگریان لێدەبارێ.))

کوڕیژگەکە هێدی و لەسەرەخۆ گوتی: ((دوێنێ چووبوومە قامیشەلانەکە کەڵەمە قامیش بۆ نووسین ببڕم، لەپڕ برووسکاندنی و کەوتمە بەر ڕێژنەی بە خوڕی باران.))

مامۆستاکە سەرێکی بادا و چەند مەشقێکی بۆکوڕەکە نووسیەوە:

((ئەمەش سەر مەشق.....چەند ڕۆژێك لە ماڵ بحەوێوە تا حاڵ و بارت بێتەوە جێ. خۆت سەرگەرمی مەشقەکانت بکە.))

کوڕیژگەکە هەفتەیەك لەماڵەوە لێی کەوت و لەناو تایێکی گەرمدا دەسووتا. کە باشبۆوە هەر بەو جۆرەی کە لەناو نوێندا ڕاکشابوو، مەشقەکانی نووسیەوە و هەرکە

کارەکەی تەواوبوو، چۆوە کن مامۆستاکەی و مەشقەکانی دایە. مامۆستاکە بەدیتنی خەتەکەی ئەو، لەسەرسامیدا دەمی وەك تەڵەی تەقیوی لێهات:

((نەخشت هێناوە کوڕەکەم. ئەمانە....ئەم خەتانە تۆ نووسیوتن؟!))

گوێچکۆڵە ناسکەکانی کوڕیژگەکە وەك ڕەنگی مرواری بریقانەوە: ((بەڵێ مامۆستا.))

مامۆستاکە بەسەرسوڕمانێکەوە چاوی بە کاغەزەکە دادەخشاند بە کرژییێکەوە گوتی:

((بەلاّم...ئەمە....ئەوە....ئەو مەشقانە نین کەمن بۆم نوسیبووی.ئەمانەت لەکوێ هێنا...؟))

کوڕیژگەکە گوتی:

((تام لێبوو. بەدەست خۆم نەبوو وەك بڵێی...

مامۆستا چاوێلکەکەی سەر لووتی جێگۆڕگێ پێکرد و چاوی لە نووسینەکەی کوڕەکە بڕی:

((من ترسم م م نییە نییە.......

ئەگەر ئەم خەونە لە خەوییێکی پەرێشانی شەوێك دەدیترێن ن ن.

یان بە وڕێنەریی ناو تایێکی گەرم م....

یان بەچاویکی بێدار و رووکراوەوە....

یان بەگیانی نی نی غەماوی ی ی ی))

بە بەرچاویکی تەماوی تەماشای لاپەڕەیەکی کرد:

((زۆر رر جاران ن ن لە خوێنیان وەر داوین ن ن.

بە بیر رر خۆت ت بێنەوە بێنەوە

و و و و تەنیا دەستکەوت کوشتار کوشتار رررر.

پارچە نانێکی ی ی بێ پێخۆر ررر خوان ن نێکی بێبەرەکەت ت تی ئێمە بوو.))

مامۆستا لە هیکڕا لە پێستی خۆی چوەدەر.

((من پێشتر پێم گوتبووی كه هیچ كاتێك ئەگەر تات لێبوو خەت نەنوسی.))
كوڕیژگەكه به سازگاری سۆزی نەی، نالأندی:
((حاڵ و بارم باش بوو مامۆستا. باش ببومەوه.))
مامۆستا بەسەریدا نەڕاندی:
((تا و وڕێنه!))
كوڕیژگەكه به جوولّه و لەرزینەوەی پشت پەردەیەكی شینی ئاوی و بیری له پەردە لەرزانەكانی پێیەكانی كردەوەو بەترسێكەوە لێوەكانی لێك هەلّپچری:
((مامۆستا بەخوا حالّم زۆر باش بوو. تەنیا كەمێك حالّی....حالّم....رەنگه....))
چەهرەی كوڕیژگەكه ئەوندە پڕ لەڕاستی و بێگوناح بوو كه دڵی مامۆستا بۆی نەرم بوو و چاوی له نووسینەكانی بڕی. له كت و كۆلأنە دوورەكانەوە نالّە و نوزە نوزێك بەر گوێی مامۆستا كەوت. وەك بلّێی هەموو مەلەكانی ئەم جیهانە، لەگەلّ ئاوازی دوزەلەیەك دەخوێنن:
((بژەنەنەی ژەن، نەی ژەن بژەنە
چەندە خۆش نەیدەژەنی نەیژەن
دەژەنی نەی له كێوان و بازاران
وامنیان كوشت له باوەشی نەیزاران[1].))
مامۆستا به بیستنی گۆرانییەكه خەم دایگرت: ((ناچارم دووبارە مەشقت بۆ بنووسمەوە. قامیشەكەت بدە من!)).
كوڕیژگەكه قەلّەم قەمیشەكەی دا دەستی مامۆستا. مامۆستا داهاتەوەو چۆوە ناوخۆی دەستی بەنووسین كرد.كه كارەكەی تەواو بوو. سەرمەشقەكەی لەبەر دەمی منداڵەكه داناو پێی گوت: ((بەدەنگێكی بەرز بۆم بخوێنەوە))

---

١- نەیزار: مەبەست قامیشەلأنە

کوڕیژگەکە بە ئاوازێکەوە دەستخەتەکەی مامۆستای خوێندەوە: (( من ترسم نییە. ئەگەر ئەم خەونە لە خەوێکی پەرێشانی شەوێکدا دەدیتریێ.)).مامۆستا هاواریکرد: ((ئەو مەشقە بخوێنەوە کە من بۆم نووسی نەك هی خۆت!)) کوڕیژگەکە ڕاچڵەکی: ((مامۆستا ئەمە.....ئەمە....ئەو مەشقەیە کە خۆت بۆت نوسیووم؟))

مامۆستا بە تووڕەییەوە کاغەزەکەی لەکوڕەکە وەرگرتەوە و بەدیتنی دەستخەتی خۆی، داچڵەکی و چاوی لەقەڵەمە قەمیشەکەی کە لەناو دەستیدا دەلەرزی، بڕی (( ئەم قەڵەم قەمیشە! لەگەڵ پشکێك خوێن!))

کوڕیژگەکە چاوەکانی لەمەلی سەرنەخشی کلیمەکەی ناو ژوورەکە بڕی:

((نەنکم دەیگوت هەر کاتێك لە نەیزارو قامیشەلآندا بروسکە و هەورە تریشقە و ڕێژنەی باران بیێ، زەل و قامیشەکان.....))

## لەم چرکەساتەدا

دار چنارەکان سی جاران گەڵاو پەلکیان زەرد بوو تەنە رووت و قووتەکەیان سێ جاران لەبەر کرێوەی بەفر و سەرما و سۆڵەدا هەڵڵەرزی.

پیاوێکی تەمەن سی و شەش ساڵی لەبەر پەنجەرەکەدا وەستاوە و سەیری شووشەی دەرگایەکی کراوەدەکا، باوکی ئەوساکە لەتەمەنی ئەودابوو. قژو برۆ،لێوە هەمیشە داخراوەکانی، لووتە کورت و سمێڵە پڕ و بابڕەکەی تازە ماش و برنج دەبوو کتومت وەك ئەو خۆی.

لە پەنجەرەکەوە سەرەتاتکەیەکی کرد. شەش قات دوور لە شەقام و قیڕی جادە. دوور لەچیمەنەکانی ژێر دار چنارەکان. چنارەکان قەدیان کردووە و هەڵچوون. چوار قات بەرز بوونەتەوە.

چڵەپۆپەکانیان دەبینێ کە بەشنەی با، دێن و دەچن و شەپۆلان دەدەن. چڵە ناسکەکانی هەرەسەرەوەیان توانای هەڵگرتنی قەلەڕەشەکانیان نییە و لە سەرەخۆ دادێنە خوارەوە.

ئەو ڕۆژانە چنارەکان کورتیلەو ناسکۆڵە بوون. بەکامیۆنێکی شارەوانی هێنایانن و لە چاڵەکانی رۆخ جۆگەکە ناشتیانن. ئەساکە بە تەنیشتیاندا تێدەپەڕی. بەدەستە بچووکەکانی لەسەرەخۆ رایدەتەکاندن.باوکەکە دەیگوت: ((ئاگاداربە کوڕەکەم. ڕەگەکەی دەجووڵێ و وشك دەبێ. هیشتا باش ڕەگی دانەکوتاوە.))

هەر ئەو ڕۆژەش، ڕێك ئەو ڕۆژە بوو، دایکە یان بەخاك سپارد. دوور لە زێدی خۆی کە هەمیشە ئارەزووی گەڕانەوەی بۆ ئەوێ دەکرد، هەمیشە خەونی بە نێو دارستانی دار بەڕو و گوێزەکانەوە دەدیت، کە هەمیشە گۆرانییە تاڵ و شیرینەکانی لە بەرخۆیەوە دەگوتەوە:

((ئەمن دەبمە درەختێکی نارنج
تۆش دارێکی لیمۆ
ئەوینێکی نوێ دروستبکەین
پڕلەتام و بۆ

دایکە سی ساڵ دوای باوکە ژیا و سی جاریدیکەی زەرد بوونی گەڵای چنارەکان دیت. چەند کەسێك لە کۆنە دۆستانی باوکە، بۆ پرسەو سەرەخۆشی هاتبوون. لەنێو ئەواندا نووسەرێکی بەساڵا چوویان تێدابوو و ئەوی ماچ کردو گوتی: ((کتومت باوکتی....بەڵام...))

-بەڵام چی مامە گیان

-وەکو تۆ گۆشەگیر و غەمبار و داماو نەبوو. پاچەیەك هەڵچون و ئومێد بوو.

-بەو کاتەشەوە کە لە ژێر دارچنارە ناسك و ساواکاندا کەوتبوو؟

نووسەرە پیرەکە گوتی:

((پێکەوە لە زیندانێ ئازاد بووین. لەگەڵ دەستەی برادەران هاتنە سەردانم. دیارییەکیان بۆ هێنابووم. پەنجا پێنووس و سەد دەفتەری سەدلاپەرەیی بوو.

-پێشتر گوێم لەمە ببوو.

-هەرکە دیاریەکی دامێ گوتی: بنووسە هەرچی بۆت نووسرا ئەو دەردو بەڵایانەی بەسەرماندا داهات، پێم گوت بەسەر چاوان کاکە گیان لەبەر خاتری تۆش بووبێ، هەردەنووسم.

لە تەنیشت پەنجەرەی ژوورێ وەستاوەو تەماشا دەکا. سەرێك بۆ شەقامەکە خواردەکاتەوە. دەنگی دایکە دەبیستێ:

((سیروان کورم سەرمەبە پێشێ. لێتدەدەن.))

خۆی دەکێشێتەوە تەنیشتێ. دایکە بە ڕەنگی پەڕیو و شێواویەکەوە چاوێك لە باوکە دەبڕێ. باوکە گوێی لە تەپ و هۆڕی ئەو پۆستاڵانە راگرتووەکە لە قادرمەکانی ساختمان و باڵەخانەکەدا سەردەکەون. ئاسانسوار لەبەر نەبوونی کەلوپەلی یەدەگی،کارناکا و ئەوان خەریکن لە قادرمەکەوە سەردەکەونە سەرێ.

باوکە دەیەوێ لە گۆشەیەکی پەنجەرەوە، تی چاوێك بداتە دەرەوە. گوللەێك رێك بە بەر پەنجەرەکەدا دەردەچێ وبەدیواری ماڵێك دەکەوێ. ژنە دەرزریکێنێ و هاوار دەکا:

((سیروان، رۆڵە! وەرە ئێرە و دانیشە.))

باوکە دەڵێ: ((تەنیا ئەوماڵەی پێدەزانی.))

دایکە دەپرسێ: ((دوێنێ چویەکێ؟))

((چوم تەلەفۆن بکەم.))

-کەست بەدواوە نەبوو سۆراغت بکا؟

-نا

-دڵنیای؟

-بەڵێ.

-نەچویە جێگاییێکی دی؟

-ناتەنیا لەگەڵ ئەمین بڕیارماندابوو یەکدی بینیین. چەند شەقامێك خوارتر تەلەفۆنم کرد.

-چی وەلاّم دایەوە؟

-تەلەفۆنەکەی هەڵگرت، بەلاّم کەس وەلاّمی نەداوە.

-هەڵبەتە خۆی لەماڵەوە نەبووە.

-نازانم. وشەییێکی کەدەبوو بیڵی، نەیگوت. منیش یەکسەر تەلەفۆنەکەم داخستەوە.

-لەدواییدا چیتکرد؟

-گەڕامەوە ماڵێ. بۆ شوتیزری چەند کۆلاّنێك لەخوارترەوە هاتمەوە. هەموو جێگاییێك پاك بوو. بارەکە ئاسایی بوو.

ژنەکە چووە پشت دەرگاو دەستی لەسەر دەسکی دەرگاکە دانا.

پیاوەکە گوتی: ((دەستی مەدەیە)).

ژنەکە گوتی: ((ماڵەکە ئاشکرابووە، هەر بەم زووییە.))

-کێبل و پێست و ئێسقان و کاکە مینی دیت کە چوار پەلان، لەبەانبەری تێپەڕی.

دەوروبەری پڕ بوو لەددان و نینۆك و خوێن.

لەگەڵ دەنگی ژنەکە، کاکەمین دوورکەوتەوە.

((بەلاّم ئەو هەمیشە چەکی پێبوو.))

چاوەکانی پیاوەکـە هـەر بـەدوای ئـەوەوەبوون کـە کاکـەمین لـەناو تـەمێکی سـووردا ببینێتەوە:

- تازە چی؟

-ژیان شیرینە. تەماشای دار چناران کە چۆن بە پـەڕی حـەزو ئـارەزووەوە بـەرەو هـەتاو هەڵدەچـن. تەماشـای قەلەڕەشـکان بکـە کـە لەسـەر درەختـی دوورە دەسـت بـەچ هـەوڵ کۆششێکەوە هێلانە دروست دەکەن.

-مانای ئەوەیە کاکە مین!

-هەتاکو من خۆشم.

لەسەرەخۆ، لەسەر هەرچوار پەلان بەرەو پەنجەرەکە خشـی و بـە پـارێزەوە سـەرێکی بـۆ خوارەوە شۆڕکردەوە. سێ جێبی خۆڵەمێشی،کەسەرەکانیان بە وێنەی شەترەنج سـپی و ڕەش بوو، لەولاوە وەستابوون.

پیاوەکە لەسەر زەویەکە خپ درێژ ببوو گوتی:

(( دەمار و پێست و کێبڵ و هێسك و ئاسن:

کوڕیژگەکـە لەچـاوەکانی باوکیـدا برووسـکەیێکی خێـرای دیـت. دەمـاری ناوچـەوانی دەرپەڕیبوو. ژنەکە سەتڵێك ئاوی لەسەلاجەکە(یەخچـاڵ)دەرهێنا و ئـاوی لـە پـەرداخ کـرد. دەستی دەلەرزی. پەرداخە پڕەکە لێی رژاو دەستی تەڕکرد. پەرداخەکەی دا سیروان.

(( بیخۆوە... رەنگت وەك پەلکە پیازی لێهاتووە.))

ئێستا فێنکی ئاوەکە ترست دەڕەوێنێتەوە. سی جاران درەختەکان رووت وقووت بوونـەوە و هەموو تەنیان لەناو بەفرو سەرمادا لـەرزی بـوو. سـی جـاران قەلـەکان هێلکـەیان لـەناو لانەکانیان دانابوو. ئێستا نەیـدەزانی وێنـەی خۆیـەتی یـان هـی بـاوکی لەسـەر شووشـەی پەنجەرەکەوە دەرکەوتووە، لەو سەری سەرەوە چاوی لەوپەڵەخوێنە بڕیبـوو کەلەسـەر جادەکـە لەکەناری ئەو سێ جێبانەدا رژابوو.

((ئاخ بابە!))

ئەمە هاواری کێ بوو؟ لە شووشەی پەنجەرەکە ڕاما. خۆی بوو یان باوکی؟

دەنگی لەدەنگی منداڵێکی شەش ساڵی دەچوو کەتازە ناویـان لـە قوتابخانەکـەی نزیـك ماڵەوەیان نووسی بێ و مانگێکی دیکە دەچووە قوتابخانە.

جانتاییێکی جوانیان بۆکڕی بوو و بابە گفتی پێدابوو کە دەفتـەرو پێنـووس و مەکینـەی قەڵەم دادانیشی بۆ کڕێ.

بابە هەردوورو دوورترکەوتەوە تـا بەشـێوەی پەڵەیـەك لەسـەر جـادە قیرەکـە و لـە رۆخ چنارەکان بەدەرکەوت.

((ئاخ بابە!))

لە پشت دەرگا، دەنگە دەنگ و هـات و بـات بـوو. لەناوەڕاسـتی متبەقەکـە، کتێـب، نامیلکە و بەڵگەنامەیان دەسووتاند. دایکە دەستە پاچـە، بەسەرهەرچـوار پـەلی، بـەدەوری ژوورەکەدا دەهات و دەچو و بۆ ئەوەی نەقیـژێنێ، لینگـە گۆرەویـەکی لـەناو دەمـی خـۆی پەستابوو. ژنە، لەپڕ لینگە گۆرەویەکەی لەدەمی خۆی دەرهێنا:

((چی بکەین؟))

-تۆ گیانی خۆت سیروان، منداڵەکەم بەتەنیا بە جێمەهێڵە. خۆت هەرچـۆنت دەوێ بـژی وابکە بەلاَم منداڵەکەم تەنیا جێمە هێڵە.

-مەگەر تۆ لەگەڵ ئێمەدا نایەی؟

پیاوەکە چووە پشت دەرگا. خەریك بوون بە قۆنداغە تفەنگەکانیان، دەرگایان دەشـکاند. لە پڕ پیاوە کشاوە دواوە. دەموچـاوی ئـارام و گـەش بـوو. رەگـی ناوچـەوانی بەرجەسـتەو دەپەڕیوتربوو لەهەمیشە و چاوە کاڵەکانی پڕ لە تریسکە تربوو. بەرەو پەنجەرەکـە رایکـرد و تیژ لە بۆشایی پەنجەرەوە خۆی فڕێدا. سیروان باوکی دیـت تەماشـای ئەویکرد،کـە دەسـت و قاچەکانی لێککردبۆوە، بەرەو خوارەوە کەوت.

لە نیگایدا، شتێکی پڕ لە هێما و راز دەدیترا کـە هێشـتا دوای تێپـەڕینی سـی جـاران رووتبوونەوەی چنارەکان، لە مانایان نەگەیشتوە.

باوکە خەریك بوو دەکەوتە خوارەوە، حەزیدەکرد وەك هی ناو فیلمـی سـینەما، دووبـارە بۆ دواوە بگەڕێتەوە. بێتەوە سەرەوە و لەسـەرۆخی پەنجەرەکـە دانیشـێ. ئێسـتا باوکەکـەی

هەڵدەکێشاوە سەرێ. بەڵام بەهەمان چوار پەلی کراوەو رەهای لەئاسمانێ. ئـەوی هێنـاوە رۆخ پەنجەرەکە بەهەمان چاوەکاڵە گەشەکانیەوە. لەو گەشایی و روونیەوە تەماشایکرد. نهینیەکـە لە وێدا بوو لە پڕێك ئەوەی دۆزیەوە و بەخۆی گوت: (( چاوی باوکە. ئیدی ئێستا لە هـەموو شتێك گەیشتم.))

باوکە هەر دوورکەوتەوە تا لەشێوەی پەڵەیێکی رەشدا،لەگەڵ گوڵێکی سپی پـەمۆیی لـە نێـوان گوڵـە سـوورەکاندا، لـەدەم چـنارە ناسـکۆڵەکاندا، لـەنزیکی ئـەو سـێ جێبـە خۆڵەمێشیە،کەسەرەکانیان وەك شەترەنج سپی و ڕەش بوون. کەوتە خوارێ.

سیروان، تەنیا لە رۆخ پەنجەرەکەوە ڕاوەستا بوو. سی سـاڵ پێشـتر تـازە خـۆی بۆچـوونە قوتابخانە تۆمارکرد بوو. حەزو ئارەزووی خوێندن و نووسین لـە گیـانی دا دەگـەڕا. رێـك وەك باوکی. هێشتا قوتابخانە نەکرابوونەوە.بەڵام ئەو هـەموو رۆژێـك بـەیانیان، جانتـا تازەکـەی هەڵدەکرت. باخەڵ و زریزەکانی دەکردەوەو دادەخست. بۆ چەند دەقەیەك لـە کـۆڵێی دەکـردو باوکە کە دەیدیت بە پێکەنینەوە دەیگوت:

((پـیرۆزت بـێ ئازیزەکـەم. جانتـاییێکی چـەندە جوانـە! نـەمردم و تـۆم دیـت دەچـیە قوتابخانە.))

دایکە بەشاگەشکەیی دەیپرسی:

((بۆکوێ دەچی کوڕە دەلالەکەم؟))

سیروانیش بەگەرمی وەڵامی دەداوە:

((قوتابخانە!))

سـیروان لەچـڵەپۆپەی درەختـەکانی دەنـۆڕی. ئـەو پەڵـە سـوورانەی سـەرگوڵە سـوورو سپییەکان بەسەر جادەکانەوە نییە.سەرو سەدای جێبە خۆڵەمێشیەکان نییە.

ژنێـك لـەژێر دارچـنارەکان، سبەسـەر ڕووبـەری چـەمەنەکانەوە تـا دووری دوور، تـا ئاسۆ،دامەنی پان بۆتەوە. گۆرانی دەڵێ و کەزیە دریـژەکانی، بـێ پـەروا، بـەربادەدا. چـەند هەنگاوێك وێوەتر قەلەڕەشکەکان بەدەوری یەکدا هەڵنیشتوون.

## دارا

کوڕە خۆ خەریکە شێتم دەکا.هەموو رۆژێ دووسعاتان، سەر لەسەعات پێنج تا حەفتی دوای نیوەڕۆ رادەکاو دێتەوە ماڵێ.

جانتاکەی کە هەر ئەم هاوینە، بۆ کتێبە نوێیەکانی کڕاوە. لەگۆشەیەکی ژووری فڕێدەدا. خێرا دەچێتە سۆراغی سەلاجەکە. هەرچیەکی بەرچنگی کەوێ دەیهێنێتە دەرێ. دەنیشێتە سەری و ژنەکەم دەداتە بەر پرسیاران: ((دیسان سەلاجەکەتان هیچی تێدانییە.)) ئەو پتر لەمن لێی پەستە دەڵێ:

((دەباشە دەی ئیدی))

-هەرسێوە گۆناو[1] وردیلەکانی دوێنێین.

-توێکڵەکەیان بکە.

-حەوسەڵم نییە.

-نەهێزی دەرس خوێندنت تێدایە نە......

-شەربەتی مانگۆ؟

-بەڵێ بۆچی واقت وڕماوە؟دیارە تا ئێستا گوێت لێنەبووە.

-بیستومە بەلاّم نیمانە.

-هەرشەربەتێکی هەتانە بۆم دروست بکە قبوڵمە، بەلاّم سەهۆڵی زیادبێ. دێت و لە تەنیشتم دادەنیشێ و پاڵ بە دیواردەدا.لینگی لێڕادەکێشێ ورگی دەردەپەڕێنێ.هەر گوێشی پێنەجوولاّوە کە بەرانبەری مامۆستای دانیشتوە. سەری ناکەمە سەر.هەروەکو لەدەرس و مەشقەکانی خۆی دەدزێتەوە.پێویست ناکا زۆری و رکەی لەگەڵدا بکەم.

---

١- گۆناو: پەلەداربوو بۆجل بەرگیش بەکاردێ.

پۆلی یەکەمی سەرتایی تەواوکردوە. یەعنی تەواوی نەکردوە، چونکە لە نووسینەوەو حیساب، خوێندنەوەو زانست و زانیاری،کەوتووە، ئەدی کەواتە لەچی دەرچوە؟ لە رەسم و کاری دەستی و وەرزش.

((دارا لەکاری دەستی چەندت وەرگرت؟))

-بیست!

-چیت دروستکردبوو؟

- مێزێکی گەورە بۆ بەرێوەبەری قوتابخانە.

-ئافەرین...ئافەرین....یەعنی خۆت دروستت کرد!

-دامانە دارتاش بۆی دروست کردین.

-بەڕاستی جوانە!

-باشە لەوەرزش چەندت وەرگرت؟

-مامۆستا بیست!

-کەواتە وەرزش کاری، ها!

-بەڵێ مامۆستا زۆرم حەز لە فتبۆلێنە. باوکم پارەی دا تا حەوشەی قوتابخانەیان قیرکرد تا بۆ یاری کردن دەستبدا و منداڵان یاری تێدابکەن.

- ئەی ئافەرین! باشە ئەدی لەرەسم چەندت وەرگرت؟

-بەلێ مامۆستا لەویش بیستم وەرگرت.

-زۆر باشە، زۆر باشە! دیارە تابلۆیەکی گەورەت کێشاوەو...

-نامامۆستا، بابم گفتی دا کە هاوینی ئەمساڵەکە. دەرو دیواری قوتابخانە چاککەنەوەو وێنەیان لەسەربکێشین.

-ئەهااا بەڵێ.

❊ ❊ ❊

-باوکی خاوەن بانکە.میرزا سوڵتان مراد، بازرگانی برنج و رۆنی کرماشانی و پەنیر و دانەوێڵە و ئەم جۆرە شتانەیە. رۆژگارێك کە لەگوندان مامۆستا بووم. قوتابیەکم

هەبوو. قوتابیەکی گێل و دەرس نەخوێن و تەمبەڵ کە هیچ هیوایەکم بەدوا ڕۆژی نەبوو. بۆفێربوونی دەرسەکان، زۆرم خوێنی خۆم خواردەوە تا بۆنموونە بە((بسم الله)) کە دەیکوت: ((بەسم لا)) بەدرێژایی ساڵێك هەفتەی دووسەعات بۆیم دووبارە دەکردەوە، بەلاّم هەر ئەوهای دەخوێندەوە. لەدواییدا کەوەڕێ بووم و وازم لێهێنا تاخۆی چۆنی دەوێ وای بخوێنێتەوە، بەلاّم چەندی بتەوێ لەوشتانەی کەلە دەرەوەی خوێندن بوون زەبەردەست و وریابوو، بۆ نموونە لەکڕین و فرۆشتنی مەکینەی قەڵەم دادان و کۆنە تیغ و وردەبەرد و بەردی درشت و رەنگاورەنگدا کە کە دیارنەبوو لە کوێیان پەیدا دەکا و ریابوو.ئەم وردەوالانەی لە یەکێك دەکڕی و دەیفرۆشتەوە یەکێکی دیکە.

تابەوەدەگا ڕۆژێك زانیم کە تەختەی دانیشتنی قوتابخانەی فرۆشتووە.

((مامۆستا سوڵتان موراد کورسیەکەی ئێمەی گۆڕیوەو یەکێکی شکاوی بۆ لە جێگا داناوین.))

-کورسییەکەی ئێوەلە کوێیە؟

-لەدەستی راستی، ریزی پێشەوەی پۆلە؟

-سوڵتان مراد، لەکاتی پشووداندا کورسییەکە ببەوە جێگای خۆی. منداڵەکانی ریزی دەستە راست نارەزاییان دەربڕی:

((مامۆستا، سوڵتان موراد ئەم کورسیەی بە ئێمە فرۆشتوە.))

-فرۆشتویەتی؟ مەگەر ماڵی باوکیەتی.کورسیەکە ماڵی دەوڵەتە. کڕین و فرۆتنی بە تاوان دادەنرێ.

-مامۆستا، هەشت ریاڵی لەم چوارەمان وەرگرتوە.

-ئێوە بۆچی ئەو پارەتان دایە؟

-مامۆستا بەخوا نەمانزانی. سوڵتان موراد پێی گوتین کە کورسی نوێمان دەداتێ.

-عەجاییب!

❊ ❊ ❊

سوڵتان موراد چەندساڵ دواتر، هاتە شار لە تەختە دارەوە دەستیپێکرد. دوایی بووە بار فرۆش و سەرەنجام لە بانکداری سەری دەرهێنا، لە گەرەکەکەی ئێمەدا زەویەکی زۆری کڕی. چەرخی ڕۆژگار بەکەیفی ئەو ئەسوڕا و لە پڕ دارایی و سامانی، هەتا ددانی زێڕی ناو دەمیشی پەنجا قات بەرز بۆوە. خانوویێکی چوار قاتی لەسەر زەویەکەی دروستکرد. منی دۆزیەوەو دارای کوڕی خستە بەردەستم تا ئەو دەرسانەی لێی کەوتووە فیریان بێ و لێیان دەرچێ:

((دەزانی مامۆستای ئازیزم، کاتێ کە یەکەم موشەکیان بە کرماشانەوە نا، ئەم منداڵە چوار ساڵان بوو. لەورۆژەوە حاڵ و باری تێکچوو.))

-بەڵام ئەوەندەی کەمن دەیزانم ئەو ڕۆژانەی کەبەرێزتان بەخێزانەوە لە باکوور بوون.

-باشە،یەعنی بەڵێ...بەڵام هێشتا دارامان نەبردبوو. لەکن داپیرەی بوو.

ئێستا چی لەو دارایە بکەم ؟ خوێنی جگەر خواردنەوە بێسوودە! دەباشە ئەویش کەسێکی وەك باوکی لێدێتەوە. دەیان هیکتار زەوی، خانوو باغ و هەوارگە لە باکوورو چەندین بەش لەکارخانەی شیر و خۆراکی هەڵگیراو...

بەڵام سوڵتان موراد پێی داگرت:

((دەبێ شتێك فێربێ. هەرنەبێ دیپلۆمەکەی هەبێ.))

هەموورۆژێك بەرنامەی خوێندنەکەی بەحساب دەستپێدەکەم:

((باشە دارا کوڕی خۆم، تادەبژمێرە بزانم فێربوویی یا نا.))

ئەنگوستە خەپلەکانی هەردوو دەستی لێکدەکاتەوە. چاوە ڕەش و بچووکە مات بردووەکانی بە پەنجەکانیدا دەخشێنێ:

((یەك...دوو...سێ...چوار...پێنج..پێنج...پێنج...پێنج..))

بەخوێن ساردییکەوە دەڵێ:

((شەش))

-ئاهـا ئاهـا مامۆسـتا شـەش، حەوت....هەشت...هەشت...هەشـت....پاڵە پەستۆی خوێنی سەردەکەوی

((نۆ))

-ئەها مامۆستا نۆ....دە....

هەوڵدەدەم لێی توورِەنەبم.

-دەباشە ئەوا دیسان ئەرکەکانت ئامادەنەکردوە. بەتۆم گوت رِۆژی چـەند جـاران ئەنگوستەکانت لێك بکەوە و لەلایە کێکەوە بیانژمێرە.بەلاٌم قسەکانی منت بەهەنـد هەڵنەگرتووە. بۆ نەتخوێندوە؟

-مامۆستا دوێنێ شەو دووهەزار کەسمان میوان بوو؟!

-دووهەزارکەس؟!

-بەڵێ مامۆستا دووهەزار کەس.

-ئاخر کورِەکەم، تۆ کەنازانی تا دە بژمێری چۆن توانیت تێبگـەی کـەدوو هـەزار میوانتان هەبوو.

-ئاخر مامۆستا زۆر زۆر بوون.

-زۆر لەگەڵ دووهەزار جیاوازە ئایا ماڵەکـەتان جێگـای دووهـەزار کەسـی تێـدا دەبێتەوە؟

بەڵێ مامۆستا ئێمە ژوورێکی زۆرمان هەیە. هی گەورە گەورە.))

-تۆبڵێ بۆنموونە چەند ژوور؟))

-بۆنموونە...بیست ژوور.

-باشە، بیست ژوور، هەر ژوورەی سەد کەسی تێدا بوەستی، ئەوساکە دەکاتە دوو هەزار، لە کاتێکدا کە یەك ژوور هەرچەندیش گەورەبێ پتر لە....

- مامۆستا هەموویان دانیشتبوون.

-باشە، خۆ ئەمەیان خراپتر. ئەگەر دانیشن جێگای زیاتریان دەوێ.

-نا مامۆستا، هەندێ کاتانیش هەڵدەستانە سەرپێ و رِادەوەستان.

-دیاره حەبی هەڵسان و دانیشتنیان خواردبوو.ها؟

-نا مامۆستا...بەڵێ مامۆستا. تەنیا یەکێکیان کە زۆر پیر بوو. حەبی قوت دەدا.

-باشە بە هەرحاڵ چ خێربوو ئەو هەموو میوانەتان هەبوو. زەماوەند بوو؟ کەسێك مردبوو؟ کەسێك لەسەفەرهاتبۆوە؟

-نا مامامۆستا.

-ئەدی چی؟

-برایە بچووکەکەمیان خەتەنەکرد.

-باشە، باشە پیرۆزی بێ. هەنووکە پێمبڵێ بزانم کەی دەتەوێ ئەم ژماردنە تا دە بەبێ وەستان لەبەربکەی؟

-مامۆستا ئەزبەری[1] دەکەم. دەتەوێ ئێستا بیژمێرم.

تەماشاییکی دەکەم وپێی دەڵێم:

((بزانە دارا گیان، تۆ هەرکارێك لە ئایندە هەڵبژێری، دەبێ حسابکردن فێربێ.

بۆ نموونە دەتەوێ لە ئایندە چ کارێك بکەی؟))

-مامۆستا..مامۆستا، باشە دکتۆر.

-ئەها،بەڵێ، دکتۆر.دکتۆرێك دەبێ زۆر بەتایبەتی حسێبکردن زۆرباش شارەزابێ.

حەب یان دەرمانێکی کەدەیداتە نەخۆش دەبێ بە وردی بە ئەندازەی دیارکراو و حساب بێ. ئەگەر تۆ حەب یان دەرمانێك لە ئەندازەی خۆی پتر بە مرۆڤ بدەی ئەوا دەیانکوژی و رەوانەی ئەو دنیایان دەکەی.

باشە مامۆستا حەبیان نادەمێ. شروبیان دەدەمێ.

-ئاخر شروبیش حیساب و کتابی هەیە. شروبیش لە ئەندازەی خۆی پتر بێ زیانی هەیە. دەبێ بەوردی حیساب بۆ ئەوەش بکەی.

بەدەم شەویلاکێکی کراوە سەیرم دەکا.

---

١ - ئەزبەر:لەبەرکردن

((باشه مامۆستا کە بوونە دکتۆر زەحمەتە.کەواتە بۆخۆم دەبمە سەندەویچ فرۆش.))

- ئەها سەندەویچ فرۆشیش دەبێ حیساب و کتابی باشبێ. کەسێك دێ، سەندەویچێك و خواردنەوەیەك دەکرێ. دەبێ تۆ نرخی ئەو دووانە لەگەڵ یەکدا کۆبکەیەوە.

یەکە ئەنگوستەکانی خۆی دەتەقێنێ و کرتەیان لێوە دێنێ:

((باشە، مامۆستا دەبمە نانەوا.))

- ئای کە جوانە لە دکتۆریەوە هاتیە سەر نانەوایی. دیسانەوە خراپ نییە.

هەرکارێکی  دەتەوێ هەڵیبژێرە، بەلاّم نانەوایەکیش هەردەبێ حسێب بزانێ. کەسێك گونیەیەك نان دەهێنێ بۆ بەر دەرگای حەوشەکەت و تۆ دەبێ بیکێشی و بزانی چەند کیلۆیە و هەر کیلۆی دەکاتە چەند ریال و سەرجەمی نرخەکەی چەندە. ئەگەر نەیزانی کلاّوت بۆ دەدورن.

- مامۆستا باوکم کلاّویکی فەرەنگی بۆ کریوم.

- پیرۆزە. دەبا ئێستا بزانیین لەگەڵ نووسینەوە لەچیدای.

- مامۆستا..مامۆستا ئەم کلاّوە لەو کلاّوانە نییە کە تۆ بیری لێدەکەیەوە. زستانان گەرم دادێ و هاوینان سارد.

- چۆن چۆنی؟!

-مامۆستا دوو قۆپچەی هەیە کە پەنجەبە یەکێکیانەوە دەنێی وەك زۆپا گەرم دادێ کە ئەویدیکەیان فشار دەدەی فێنك دادێ. پاتری هەیە مامۆستا.

- سەیرە! لەباتی کلاّو خۆزگە مێشکێکی بۆ دەکڕی.

- مامۆستا، هەموو ڕۆژێك باوکم سەرو پێ و مێشکم بۆ دەکڕێ

- دەك بە گیانت کەوێ. وا چێترە سەیری نووسینەوەت بکەین. پێنووسەکەت بگرە دەست و بنووسە.

- مامۆستا ئیمڕۆ پێنووسێکم لە کۆلانێ لـە منـدالآن کـڕی بـە سـێ تومـەن و فرۆشتمەوە مندالەکەی هاوسێکەمان بەچوار تومەن.

-ئەها. باشە کەواتە چەندت قازانج کرد؟

-مامۆستا یەك تومەن.

-ئافەرین! ئەی ئافەرین. باشە بەلآم...بەراستی تۆش...وەك باوکت...مات مات تەماشام دەکا.بە توندی دەلێم:

((بنووسە.گەلای داران لە پایزان وشك دەبن و هەلدەوەرن.))

تەماشـای دەسـت و قەلـەمی دەکەم.((گـەلا))ی نووسـیوە((گلا)).لەباتی وشـك نووسیویێتی خوشك.

بۆ ئەوەی ئاگاداری هەلەکەی بێتەوە ووشەی گەلا چەند جاران دووبارە دەکەمـەوە و لێی دەپرسم:

((هاوینان گەلای داران رەنگیان چۆنە؟))

خێرا وەلآم دەداتەوە

((مامۆستا وەك رەنگی گەلای کاهو.))

بەخۆ خواردنێکەوە دەپرسمەوە:

((گەلای کاهو چ رەنگە؟))

- مامۆستا وەك رەنگی گەلای داران.

- گەلای داران ڕەنگی چۆنە؟

- مامۆستا وەك رەنگی خەیار.

مشتی خۆم کۆدەکەمەوە تا بەسـەرو میـژەلاکی خۆمیـدا بکـوتم. ددانـەکانم لـە جیڕەوەدەبەم:

((خەیار چ ڕەنگێکی هەیە؟))

-مامۆستا... ڕەنگی گەلای دار

گێژووڕدەبم وسەرم دەسوڕێ.

لەناو ژوورەکە دەکەومــە ســەر گــازەرای پشــت. ژنەکــەم کــە خــەریکی ســەوزە وردکردنە، دەزریکێنیٚ و بەپەرداخێك ئاوەوە بەرەو لای من ڕادەکا:

((خەریکە خۆت دەکوژی. وازی لێبێنە لە گۆڕی باوکە ملیار دێرەکەی ریام.))

دارا دەستم دەگریٚ و بەدڵە خورپێیەکەوە دەڵیٚ:

((مامۆستا رەنگت زۆر بزرکاوە. لێی گەڕیٚ گو بەگۆڕی باوکە مەلاردەرش.))

بە بینینێك پەرداخە ئاوەکە هەڵدەقوڕێنم. چاوەکانم دەنوقێنم و بەخۆم دەڵێم:

((ببینە منی بەد بەخت کەوتومەتە چ رۆژێکەوە.......))

بە هێمنی و هێوریەکەوە لەدارا دەپرسم:

((داراگیان. رەنگ و روم ئێستا لە ڕەنگی چی دەچیٚ؟))

-مامۆستا وەك پفك

-رەنگی چۆنە کوڕم؟

-مامۆستا وەك....وەك توێکڵی مۆز.

-توێکڵی مۆز رەنگی چۆنە؟

-مامۆستا..وەك رەنگی شەربەنی ئەنەناس

لەپڕ بەسەریدا دەقیژێنم:

((زەرد...زەرد...زەرد!))

ئیدی چاوم هیچ نابینیٚ.

## بستێك داوە بەن

بەرێوەبەری بەندیخانەکە، سەر پاسەوان نیزامی نیزام ئابادی بەرێوەبەری بەندیخانـەکانی چـوارو پێـنج کـە بـە ملـە درێژەکەیـەوە لـە کەلەشـێرێ دەچوو...چـاوە خـەواڵوەکانی هەڵگلۆفی،باوێشکێکی داو لە بەرانبەری ژووری سەرهەنگ راوەستا.

بەرێوەبـەری بەندیخانــە پیاوێـك بـوو قـەیرە، بـەخۆی و ژنـە هەمیشـە نـەخۆش و دەردەدارەکەی و پێنج منداڵی سەلکە و بنکەوە کە لە دووچاوە خانووی بـەکرێ دەژیـان و نزیکەی نیوەی مانگانەکەی بەکرێی خانووەکە دەدا.هەمیشە خـۆی دەخسـتە بـن قـەرزو قۆڵەوە، تا ناچار دەبوو لە زێدە خەرجی خۆی و منداڵەکانی بگرێتەوە.

شەو و ڕۆژ لە خەونی وەرگرتنی پلـە و پاداشـت دابـوو و هەوڵێـدەدا بـەهۆی خـۆش خزمەتیەوە ئەو هەل ومەرجانە بێنێتە دەست، تا ناوی خۆی لەریزی ئەو کەسانەدا بنوسـێ کە خانووی سازمانیان دەدرێتێ.وە ئـەویش لـە ڕۆژی شـەممەی دووەمـی مـانگی ئابـانی ١٩٧٦ و هەڵبەتە وەك ئـەو واتـەنی ٢٥٣٥ی شاهەنشـایی هـەلێکی لـەبارو بـەختێکی گەورەی بۆ هاتبوە پێش.

خەبەرێکی نوێ و دەستی یەکەم و زۆر حەساس لەمەڕ بەندیخانەی حەوت و بەندیخانەی چواری زیندانی ژمارەیەکی سیاسی .بە دەردی ئەو واتەنی زیندانی دژی هێمنی و ئاسایش کە لەو بەشەی بەندینخانە چەند زیندانیـەکی نارەحـەت و بـەدەردە سـەر دەژیـان، پەیـدا کردبوو.

سەر پاسەوان دەستێکی بەقۆپچەکانی داهێنا بەهەردوو دەستی لێوارەکانی کلاوەکـەی جوان دا گرتە خوارێ و سافیکردەوەو.رێك وقیت وەستا، ئحمێکی کرد.

هەندێ بۆ پێشەوە داهاتەوەو زۆر نەشارەزایانە بە پەنجە لـەدەرگای ژووری سـەرهەنگی داو لەبەر  پەلەپەلی بەبێ ئەوەی چاوەڕێی وەڵام بێ، دەگاکەی کردەوە. پێی ڕاستی نـا نـاو ژوورەکەوە...ش...ت...\\\ق...داخ...(*) تەمەننایەکی ڕێك وتوندی کرد.

جەنابی سەرهەنگ بەدەست و پێ ئاڵۆزکاویەکەوە مووکێش وئاوێنە بچـووکەکەی بـەر باغـەڵی بـەخێرایی لـە ژێـر دەسـتەی کاغـەزەکانی خەبـەراتی ئـەورۆژە وراپۆرتەکانـدا شاردەوە.دەستێکی بەپشتی برۆ ژنانیەکانیدا کێشاو گوتی بەڵێ..فەرموو..چـی هەیە.بـەم بەیانی زووە خێرە؟!)سەر پاسەوان نیزامی نیزام ئابادی کە لەبەر دەستە پاچـەیی گـەردەنی لە جاران درێژتر دەهاتە بەرچاوان وقلْپیـك لـە گـەرووی وردە وردە سـەری دەکرد.تـۆزە و بەپارێزە وە لە کونەلووتی رەوانی دەرێـی کـردو بـەمجۆرە خەبەریدا:(بـەحزووری موبـارەکی جەنابی سەرهەنگ ئیمڕۆبەیانی لە دەوروبەری سەعاتی هەشت کە بـۆ سـەرخوارکردنەوە و چوو بوومە بەندی دوو لە پشت دیوارەوە،ژوورەکانی بەنـدی چـوارەمم چاوپێداخشـاند،داوە بەنێك بە درێژی نزیکەی دووبست ونیو سـەرنجی ڕاکێشـام.جۆری بـە نەکـە و جنسـەکەی وانیشـاندەدا کـە لـە ڕێگـای ناقانوونیـەوەو لـە شـوێنی غـەیری چـاوپێککەوتنی سەردانەکان،هاتۆتە ناو بەندیخانەو لە رۆخی شیشەکانی پەنجەرەی سەرەوەی سلولی حـەوتی بەندیخانەی چوار،بۆ ناوەوەی بەندیخانەی دوو، شۆڕبۆتەوە تکا لە جەنابی پایەبەرزتان دەکەم کە بەسەر ئەم کارە ترسناکە رابگەن). سەرهەنکیش کە گەشابۆوە،لە جێگای خـۆی رەپـێ بـوو بـەرەو لای سـەرێ بـۆکن پاسـەوانەکە چـوو و دەسـتی لـە سـەر شـانی دانـاو گوتی:(هەرئێسـتا ئاگـاداری ئەفسـەری کێشکگر(شوعلەناز)بکە.(سەرچـاوان قوربان!)سەرپاسەوان کشاوە دواوەو قیت سەلامیکی کرد ش.ت..///ق...داخ و بـەرەو لای ژووری ئەفسەری کێشکگر رۆیشت ،جەنابی ئەفسەر شوعلەنازکە خـەریکی داخسـتنەوەی سەری شووشەیەك کۆڵنیاوبوو،دەتگوت بە هـاتنی سـەر پاسـەوان بـۆنیکی نـاخوش بـەو ناوەدابلاۆبۆوە.لووتی خۆی واگرت ودوای گوێگرتن لەخەبەرە بۆندارەکەی سەرپاسەوان بۆنی نانی ترشاوی تێکەڵ بەقیری جگەرەی بە بەرلووتی ئەفسـەردەکەوت .میکرۆفـونی بەنـدی چواری گرتـە دەسـت:(ئاگاداری...ئاگادار..تێکڕای زینـدانیانی دژە ئاسایشـی نـاوژووری

حەوتی بەندیخانەی چواربەزووترین کات سەردانی بنکەی پاسەوانی بکەن،یەکەم کـە چـووە ژووری سـەرهەنگ. لاوێکـی بـە لـە باریکـە و بێـرەنگ بووکەیـە تـاوانی نووسـینەوەی نامیلکەییێکی کۆن بە حەوت هەشت ساڵ زیندانی حوکمدرا بوو.سەرهەنگ کە لـەرەفتاری ئەولەکاتی هاتنە ژووریدا نارەحەت دەهاتە بەرچـاو. لێوەکـانی خـۆی لێسـتەوە، وشـکی کردوەو بەبیٚ ئەوەی فەرمووی دانیشتنی لێبکا وتی:ئێـوە لـە دەرەوەی زینـدان هـەر کـە دەچوونە ژووری باوکتان سەلامتان نە دەکرد؟!!کـورِە گەنجەکـە هەولێـدەدا هـێمنی خـۆی بپارێزیٚ وبە شکۆوە وەلاٚمی داوە(ناجەنابی سەرهەنگ سەلاٚمم نەدەکرد!).سـەرهەنگ بـە شێواوی و نارحەتیەکـەوە پرسـی: (لەبەرچـی؟)(لەبەر ئـەوەی سـەلام کـردن و نـە کـردن مەسەلەیێك نییە!)ئای لە دەست ئێوەگیانەوەرینە ،دڕندەینە.ئاخر ئێوە چـیتانە ئـەم وشـە نەعلەتیەی (مەسەلەك نییە)دووبارە دەکەنەوە. دە باشە ئێستا پێم بڵیٚ بۆچـی مەسـەیەك نیە؟کورِەکە خۆی بە هێزو سەرحاڵ نیشان دەدا بە زەردەخەنەییێکی گاڵتە جارِییەوە گوتی ( :چونکە باوکم نیە).(کاتیٚ باوکت مابوو چۆن ،ئەوسـاکەش سـەلامت نەدەکرد؟)(ئەوکاتـە باوکم ئەوەندە بەدەست کارو زەحمەتی ژیانەوە گیرۆدەبوو کە قەت نەمدەدیت.هـەر کاتێـك کە دەهاتەوە ماڵی من نوستبووم و بەیانیش من هەر لە خەودابووم کە دەرۆیشـتەوە سـەر کارەکـەی ). (ئاە..لەراسـتیدا..هەرکاتێك کـە دە تانـەویٚ قسـەیەك بکـەن هـەزاردەلیل وبورهان دەهێننـەوە و کـە مـرۆڤ کـە وەرێدەکـەن، باشـە وازبێنـە، بابێینەسـەر راسـتی باسەکە.بەپێی ئـەوەی مـن ئاگادارکراومەتەوەئێوەلەگـەڵ برادەرەکانتـان تـەواوێك بـەن و کندرِەتان ئامادەکردوە و دەتانەویٚ لە پەنجەرەکەی ژوورەکەتانـەوە کارێـك بکەن.مەبەسـت لـەداواکردنتان بـۆئێرە روونکردنـەوەی ئـەم مەسـەلەیە،پێمبڵێن ئـەم کنـدرِتان کوێـوە هێناوە؟)(کیٚ و بەچ رێگاییێك بۆی ناردوون؟ئەوانەی کە دەیانەویٚ ئەم کندرِەبەکاربێنن کێن ومەبەستیان لە هێنانی چـیەوچ نەخشـەو پیلانێکتـان لەژێرسـەردایە؟تاکاغەزو پێنـووس بۆلپکۆڵەرەکە ئامادە دەبیٚ.ئێوە وەلاٚمم بدەنەوە).کورِە گەنجەکە بە سەردانێکەوە تەماشای ئەملاو ئەولای ژوورەکەی کردو بە هێمنی وەلاٚمیداوە:(جەنابی سەرهەنگ ژوورەکەی ئێمە پەنجەرەی تێدانیە مەبەستم ئەوەیە دوومانگ پێش ئێستابەفرمانی جـەنابتان دایانخسـت و

شووشەکانیشی بەرەنگی رەش رەنگکران. ئەگەر دەڵێن وانیــە، فــەرموو زەحمەتبکێشــن و تەماشــای بکەن).گەنجەکــە هەڵوەســتێکی کرد.ســەری بــەرز کــردەوە و لەسەرســوڕمانی سەرهەنگ سوودی وەرگرت:(جگە لەمەش خۆئێمە شێت نەبووین بەکندرێك لە بەندیخانەی حەوتەوە بۆبەندیخانەی دوو راکەین).سەرهەنگ بە دڵە خورپێکەوە گەنجەکەی بۆژوورەکــەی رەوانکردەوە و پاسەوانێکی بەدوای بەڕێوەبەری بەندیخانەدانارد.هەر کەبەڕێوەبەرەکــە هاتــە ژوورەوە.سەرهەنگ بەرووێکی داگیرساوەوە و دەنگێکی لەرزۆکەوە هاواریکرد: (بۆخەبــەری هەڵە دەدەی؟چاوتان بکەنــەوەلوردبنۆڕن! ژووری حــەوت دەمێکــە پەنجەرەکــەی پەرچــراوە وداخراوە.ئەمەچەندە جارە ئەمجۆرەشەکرانە دەشکێنیّ!). بەرێوەبەری بەندیخانە کە ناودەمی وشك ببوو بە زۆرلێوە کانی هەڵپچڕی و دوای چەندجارشەویلاك بەیەکدادان بــە دەنگێکــی کە لە قڕەی قەلەرەشکە دەچوو گوتی: (جەنابی سەرهەنگ..تکا دەکەم نارحەت مەبن. تــا ئەو رادەیەی کە بەرچاوی من کەوتووە دەبیّ ئەو پەتە لە پشت پەنجــەرەی ژووری حەوتــەوە شۆڕبووبێەوە. ئێستا رەنگە بەهەڵە داچووبم و نــەمتوانیوە بەڕاســتی ژوورەکــە دەسنیشــان بکــەم). (دەکەواتــە بڕۆبــە باشــی چــاوەکانت بکــەوە و ببینــە هــی چ ژوورێکــە). (سەرچاوقوربان.. هەرئێستا). هێشتا سەرهەنگ مووکێش و ئاوێنەکەی نەگرتبۆە دەســت کە  دووبارە سەر پاسەوانەکە بە هانکە هانــك گــەڕاوە: (جــەنابی ســەرهەنگ مەســەلەکە پێوەندی بە ژووری نۆوە هەیە.فەرموون خۆتــان تەماشــای بکــەن دوای لێکۆلینــەوەییێکی زارەکی لەگەڵ زیندانیــەکی ژووری نــۆ بەدەرکــەوت کــە پەنجــەرەی ژوورەکــەی ئــەوانیش پەرچکراوە و داخراوە ئەمجارەشیان دیسان لەبــەر دەســتە پاچــەیی ســەرکار نیزامــی نیــزام ئابادی دووبارە هەڵە کراوە و دوایی چوونە تەماشای ژووری هەشت کــە رووبــەڕووی ژووری نۆ بوو ئینجا دوای ماوەیەك هێنان و بردن بە دیارکەوت کــە ئــەو ژووە لــەو لای دیکــەی سالۆنەکەیەو هیچ پەیوەندییەکی لەگەڵ بەندی دوودا نییــە، ســەرەنجام دوای دوو کاتــژمێر بەملاو ئەولادا رۆیشتن و راکێشانی زیندانیەکانی سیّژووران ئاشکرابوو کە ئەو پەتکە لــە پەنجــەرەی ژووری یــانزەوە شــۆڕبۆتەوە، ئەمجاشــوعلەنازی ئەفســەر بــە دڵنیایــەوە میکرۆفونەکەی هەڵگرت ویەك بە خۆی بانگی کرد: (زیندانییەکانی ژووری یانزە بێنە بنکە

ی پاسەوانی.ئەوانیش بەزووترین کات هاتنە ئەویّ). لە ژووری یانزە پێنج کـەس زینـدانی بوون.یەکێکیان پینەدۆزێك بووی کە شەوێك زیندانیەکی راکردووی لە ناو دوکانەکەی پـەنا دابـوو، لەبـەر ئـەوە حـوکمی هەتاهـەتایی بەسـەردادرابوو. دووەمیـان نـان پێـوەدەری نانەواخانەیەك بوو کە دووسالّ پێش ئێستادوای خواردنەوەی شووشەبێك فۆدگا و چـووبووە بنکەی پۆلیسی نزیك نانەواخانەکە و گوتبووی: (بە پێی فەرمانیپایەبەرزشـای ئێـران کـە فەموویانە ئەوانەی دژی منن دەبیّ لەم ولاّتەدا بچنە دەرەوە منیش دژی ئەم حوکمەتـەم و دەمەویّ لێی بچمەدەریّ). پیاوانی پۆلیسیش بە فـەرمانی بەرێوەبەرەکـەیان دارکاریـەکی مزریان کردبوو، بە کەلەپچەکراوییەوە بە دەستی ساواکیان دابوو. سـاواکیش لـە دادگـای سەربازی حوکمی زیندانی هەتاهەتایان بۆدەرکردبوو و پێیان گوتبوو: (فەرمو ئێستا برۆنـە دەرەوە. هیوادارین کاتێکی خۆش بەسـەر ببـەی )کەسـی دووەم قوتـابی سـالّی دووەمـی کۆلێژی دەرمانسازی بووکە لە خۆپیشـاندانەکانی بـەردەمی زانکۆکـە بـە بۆنـەی شـازدە هەمی ئازەرماە سازیان کردبوو، بەر لە سالّیك گرتبوویان و لەتە بـەردێکیان لـە باخـەلّی گرتبـوو و هەلّبەتـە ئەوەنـدەی هاواریکردبووکـە ئـەم بـەردە بـۆ تاقیکردنەوەیـە و بۆئەزموونگام هێناوە، قسەکە یان لێوەرنەگرتبوو لێکولّـەرەوەکان گوتبوویـان کـە بـەردی تاقیکردنەوە جەزای پترە، چونکە ترسناکترەو لە ئەنجامـدا بـە تـاوانی تێکـدەری و بـەرد بارانکردنی بنکە دەولّەتیەکان پێنج سالّ زیندانی بەسەردا سـەپێندراوبوو، چـوارەم کـەس عەرەبێکی چۆلّینشـین بووکـە لـە نزیکـی سـنوورەکانی ئێـران و عێـراق دەسـتگیرکرابوو تاوانەکەی دانی زانیارییەکانی سنووری ئێران بـوو کـە گوایـە بـە عێراقـی داوە کـە ئـەم زانیاریانە بە پێی دانپێـدانانی خـۆی لـە پاشـۆلی ولاّغەکـەی تەقـەتکردبوو ، بـەلاّم لـە بەدبەختی ئەو، ئەم ولاّخە چەمووشە رێك لە بەرانبەر بنکەی پاسەوانی شاهەنشـاییدا بـە هۆی تەرسکردنی ، بەستە توند پێچـراوەکەی خەبەراتـەکان، وەك گوللـە تۆپێـك کـە لـە لوولـەی تۆپـەوە دەرچـیّ ئـەوها لـە خـۆی کەرەکـەوە دەرپـەڕیبووە دەریّ و لەبـەر پێـی کاربەدەست و فەرمانبەرەکانی ئەوێبەربۆوەسەر زەوی. دواکەسیش مامۆستایەك بوو کە لە پۆلدا قسەیێکی ناجۆری لەدەم دەرپەڕیبوو. ئەویش ئەوە بوولە باتی بلّـیّ بـە فـەرموودەی

شاهەنشا، بەلاّم زمانی تێکئالاّبووگوتبووی: بە فەرموودەی مارکسی (دەباشە هەلەیەکە وکراوە) جەنابی بەرێوەبەرەکە ئەندامێکی دیاری پارتی رستاخیزە بووە، یەکسەر خەبەری لێداو مامۆستاکە هەشت ساڵ حوکم دەدرێ، بۆچی؟ چونکە بە پشکنینی ماڵەکەی کاتێ ژێر سەرینەکەی دەنۆڕن لەباتی کتێبی شاهەنشا کتێبی سەرمایە دەبیننەوە، بۆیان روونەبێتەوە کە ئەم زاتە زمانی نە ئالۆزکاوە ، بەڵکە دەستی ئالۆزکاوە، بە هەلە کتێبی گومڕاکارانەی بۆ خوێندنەوە هەڵبژاردووە. درێژەی پێنەدەین پێنج کە سی ژووری زیندانی ژمارە یازدە بە پەلەپەل جلوبەرگی زیندانیان لەبەر کردو لە پشت دەرگای بنکەی پاسەوانی بە چاوەڕوانی راوەستان. لە سەر مێزەکەی سەرهەنگ تۆپەڵێك پەت و کندڕ و زبڵ و خۆڵ و داندرابوو. لە بەر ئەوەی هەر مەئموورێکی زیندان کە بەرۆخ مێزەکەدا تێپەرییبوو و بۆخێری گۆری باوکی شتێکی خستبووە سەر کۆمەڵەکە. هەرکە عارەبەکە کۆمەڵە پەت و داوەکەی دیت بە هەردوو دەستان بە سەری خۆیدا کێشاو نالاّندی: (وای..وای..قۆرم بەسەربووکلۆڵ و داماو بووم. یەکجارحوکمی هەتاهەتایە درام و ئێستا ئیعدامی بە دوا دادێ). نان پێوەدەرەکە بەدیتنی کۆمەڵە پەت و بەنەکە چاوە کانی هەڵگلۆفی و بە خۆی گوت: (دیسان پەروەند دروستکردن ولاپەڕە هەڵدانەوە. دیسان ئەشکەنجە و ئازار. ئاخر پێم نالێن ئەم تە غارە داوە بەن و پەتانە لە کوێ هاتوون؟). دوای نووسینەوەی سورەتێکی دانیشتنەکە. لێکۆڵەرەوەکە کە لە نانەواکەوە دەستپێکرد. پ ـ زیندانی دژی هێمنی و ئارامی دەولەت عەباس نانەوای حوکمدراوبە ئەبەدی . پێناسەیتۆ کە گومانی تێدانیە . پەیوەندی و رۆڵی خۆت لەوە روونکەنەوە، بۆم باسکەن کە ئەم پەتە لە کوێوە هاتووە؟ وـ من نازانم ئەم پەتە لە کوێوە هاتووە. ئەمە چ بەلاّیەك بووە کە لە پەنجەرەکەی ئێمەوە هاتووە. هیچ ئاگام لێ نیە . شەو نووستووم . دڵە کزەم لێبوو.بە یانیەکەی کەمێباشتربووم، بەلاّم کاتێدەنگۆی ئەم پەتە لە ناو بەندیخانە بلاّوبۆوە دووبارە مەعیدەم بەسوێ هاتەوە. ئایا ئەم پەتە لە ئاسمانەوە هاتووە؟ من نازانم . ئایا کەس دوژمنایەتی لەگەڵمندا هەیە؟ ئەمەش نازانم. بەگشتی من شتێك لەم بارەوە نازانم تا بینووسم. ئێستا ئەم پەتە وەك مارێکی بێ ئامان هاتۆتە زگ ژیانی من و برادەرەکانی

ژوورەکەم و زیندانی لیّ رەشتر و خەماویتر کردووین. هەر ئەوەندەو قسەیەکی دیکەم نیە.
سەرهەنگ دوای خوێندنەوەی لێکۆڵینەوەکە پێکەنینێکی گاڵتە ئامێزی کردو گوتی: (بڵێ ئەوهاو ئەە هیچ نازانی! قسەیێکت نیە ! بەم زانیاریانەتەوە دەتویست لەو ولاتە بچیە دەرەوە. ها!!!؟!) رووی لە پاسەوانەکە کردکە لە تەنیشت نانەواکەوە وەستابوو گوتی: (بیبەنە ژووری تەنیایی . بیدەنە دەست گروهبان عەباس تا بە خزمەتی بگاو تێیبگەیەنیّ). ئەو زووترلە دێیەکانی زنجان لە کارگەیێکی خوری شوشتن کاریدەکرد. تاقیکردنەوەی سالآنێکی دووردوێژی خوری کوتینی بۆکارە نوێیەکەی گوێزابۆوە وبە تێلا گوناحکارانی وەك خوری دەکوتان. بردیان،سەریان بەمەکینەیێکی کول لە کۆڵکداو فرێیان دا ناوژوورێکی بۆن خنك وتاریك ، گوایە زووترئاگادارت نە کردین کە ئەم تاوانبارانە دەیانەویّ رابکەن؟) عارەبەکە منەمنێکی کردگوتی: (بەخوا..هەرئاگاو خەبەرم نیە. ئەم پەتە لە کوێوە هات . من بە هیچ جۆرێك پەتی نە دەیت. ئەگەردیتی خەبەری دا...).
سەرهەنگ بەگاڵتەوە زەردەخەنەیەکی هاتیّ و لێوەکانی خۆی لێستەوەو گوتی: (خۆت بەعەرەبىازی مەپەڕێنەوە ئەو سەری. هەر کەدەکەویە تەنگانە زمانی عەرەبیت دێتەوە یاد. یاللاّ دەی چی دەزانی قسە بکە،بزانم پەتەکەت لەکویّ هێنا؟)
عەرەبەکە قسەیێکی نەبوو بیکا ولە ئەنجامدا لەبەرخاتری ئەوەی هاوکاری کار بەدەستانی قبولکرد ئەویان بەخشی و ناردیانەوە ژووری بەندیخانە، بەلاّم پینەدۆزەکە کە بەزی لەشی بۆ دارکارییەك و بەندیخانەیەکی تەنیا کۆکردبووە و بەمجۆرە نووسی:
وەلاّم: من نازانم ئەم بستە پەتەی کەهیچ ناهێنیّ لە کوێوە هاتووەو بۆتە تۆپەڵێك پەت وئەم ئاگرەی ناوەتەوە.خۆزیە هەر ئەمشۆکە ئەم بەندیخانەیان بەملی من دادەدا و سەرم رحەت دەبوو.
ئاخر توخوا ئەمەش ناو لێدەنێی ژیان. کەسێکی غەریبە ونەناسراو شەوێك لەدوکانە کاولە وێرانەکەی مندا نوستووە،دەبیّ هەتاهەتایە هەر ڕایبکێشم و هەموو ڕۆژێك لێکۆڵینەوەو لێکۆڵینەوەکاری کە ئەم بستە پەتە لەکوێوە هاتووە؟بۆچی کلکی فلّچەکەت تیژ بووە.بۆچی ریشت بەنارێکی هاتووە بۆ وەرزش دەکەی؟ بۆچی بەگۆشەی چاو و لاونیو

تەماشای پاسەوانان دەکەی؟ بۆچی کاتێك کە سەرهەنگ بە بەندیخانەدا تێپەڕیوە تۆخۆت لە سەلام کردن دزیوەتەوە،خۆت هاویشتۆتە یەکێك لەسلولەکان؟بۆچی خواردنەکەت بەتام و چێژەوە ناخۆی و هەڵیدەدەیە ئەولا؟ئاخر بابە چیتان لەمن دەوێ حەبسی ئەبەدیتان بەموفتی بەمن داوە لێمگەڕێن با رایبکێشم وچیدیتان لێم دەوێ؟ من سوێند دەخۆم کەهیچ ئاگاییێکم لەپەیدابوونی ئەم سەرەپەتەی نیە کە لە پەنجەرەی یازدەمەوە دەرکەوتووەو نازانم چ جن وئینسێك ئەمەی بۆ گیانی ئێمە هێناوەتە ئێرە.سەرەتا گوتتان سەرەپەتێکە.ئێستا تا گەیشتۆتە ژوورەکەی سەرهەنگ،بۆتە گونیەیێك سەرەدا پەت وکندرِ ودیار نیە بەیانی نایکەنە کارخانەییێکی جۆلایی وداورێستن و و دەبێ ئێمە ئەوها وەلاّم بدەینەوە کەکارخانەکەمان لەکوێوە هێناوەتە ناو زیندان. من قسەیەکم لەسەر پەت و داو نیە لەسەر بوون و نەبوونی بەسەر ئەولای دیواری بەسیم گیراو و ئەستوری زیندانەوە ئاگاداریەکم نیە.سەرهەنگ بە خوێندنەوەی لێکۆڵینەوەکەی پینەدۆزەکە،دەستوریدا ئەویش بە دەردی نانەوانەکە ببەن. چەندچرکەییێك زیاتر پینەدۆزەکە بە سەری تراشراوو پێی خوێناوی و پەنجەی برینداروە لە قوژبنێکی بەندە تەنیاییکەی دەینالاند.دوای بەڕێکردنی پینەدۆزەکە سەرهەنگ قیافەتی مامۆستاییێکی زانکۆی وەرگرت.کلاّوەکەی لەسەری خۆی لادا و بە هێمنی لەسەر مێزەکەی دانا.فەرمووی لە قوتابیەکەی دەرمانسازی و مامۆستاکە کردبوو دانیشتن. لەدوای ئەو بە هێمنی گوتی: (چۆن چۆنیە کە دژە ئاسایشێکی زیندانکراو کە خۆی زۆریش بە هۆش و دانا دەزانێ و لە پاشماوە و زبڵی زینداندا دەتوانێ شتومەکی سەیر و سەمەرە ئامادە و دروستبکا. خۆی ئەوەندە بەسستەزمان و بێئاگا نیشاندەدا کە هەتا لە بوونی پەتەکەی بەر دەمیشی خۆی لە گێلی دەدا. ئەمە خەیاڵی ئێوە بۆچی دەبا؟ بۆبێخەبەری ئێمە! بۆ لاوازی بەڕێوەبەرێتی! بۆ لاوازی حوکمەت! نا جەنابینە ئەم جۆرە بیرو خەیالاّتانە کەڵکتان نا گرێ. ئێمە شەو رۆژ لەم شوێنە بە چوار چاوان سەیرتان دەکەین. نەك هەر لەرێگای پاسەوانەکان و ئێشکچیەکان، بەڵکە بە هۆی شتی دیکەوە کە لە ناوەوەی خۆتاندان. دەتانەوێ خەبەرێکتان بۆ بخوێنمەوە کە تێیدا نووسراوە دوێنێ ئێوە جەنابی مامۆستا لە کاتی

چاوپێککەوتنتدا چیت گوتووە؟). مامۆستا ویستی دەمبکاتەوە کە سەرهەنگ هاتە نێوانەوە و گوتی: (ئەی جەنابی قوتابی دەرمانسازی دەتەوێ پێتیبلێین کە ئەو کیسەی بە دیواری ژوورەکەتانەوە و بە سەر سەرتانەوە هەڵواسیەوە، چەند قەڵەم و قەڵەمی دیکەی تێدایە؟ ئێمە ئاگامان لە هەموو هەست و خوستی ئێوە هەیە. بەڵام ئێوە بە هەڵە داچوون زۆر سادە بیرتان لێکردۆتەوە). (چ خە یاڵێکی پرو پووچە! رەنگە یەکێك لە نێوان ئێوە دا هەبێ دەستەیەك مەوادی تەقینەوە لە کیسەکەتان باوێ، دەبێ ئێوە ئەوەندە گێل و گەلحۆ بن کە نە زانن کێ ئەم کارەی کردووە؟ ئێستا بەو پەڕی رێزەوە داواتان لێدەکەم ئەوەی کە لە بارەی ئەم پەتانەوە دەیزانن بینووسن). بەڵام کاتێ قوتابی و مامۆستاکە نکۆڵیان لە نووسین کرد، سەرهەنگ کلاوەکەی لەسەر ناوە و فرمانیدا و پاسەوانان هەر لە ژوورێ هە دووکیان لە خوێن گەوزاندن و لاشەی سست و بێهۆشی ئەوانیان لە نێودوو پەتووی سەربازیدا پێچاو فڕێیاندانە ناو ژووری زیندانی تەنیاییەوە. رۆژێکیان سەر لە ئێوارەکەی سەر پاسەوان نیزانی نیزام ئابادی لە بەندیخانەی دوو خەریکی کاری ئێشکچیەکان بوو. ئەو لە بەر ئەوەی منداڵەکەی شەو تای لێبوو خراپی لێگوزەرابوو. پاڵی بە دیواری بەرزی زیندانەدا بوو و بە دەم هەڵکشانی مژێکی گەورەی جگەرەوە، لە گۆشە و کەنارەکانی بەندیخانەدا چاوی دە گێڕا بۆ ئەوەی خەبەرێکی تەڕ و تازە ئامادە بکا. لەم وەختەدا مەلێك لە کونی سیمە دڕ کاویەکانەوە، فڕیە ناو حەوشەی زیندان و لەو دیو پەنجەرەی ژووری یازدەوە نیشتەوە. مەلەکە بستە پە تێکی بە دەندووکی هەڵگرتبوو لە پشتی پەنجەرەی ژووری یازدەوە هێلانەی دروستدەکرد.

(*) مەبەست دەنگی پێیەکانیتی کە بە زە ویدا دەکوتێ.

(*) ئەمە ئاماژەیە بۆ زمانی ئەو بابا عارەبەی گوایە فارسی باش نەزانیوە.